


# بەئیسلامکردنـی کـورد

## ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟

### ئاشکراکردنی هەندێ لە هەڵەکانی
### ئەو لێکۆڵینەوەیەی زانکۆی سلێمانی
### بڕوانامەی ماستەری بە پلەی نایاب پێ بەخشی

**فاضل قەرەداغی**

**چاپی دووەم**

**بۆی زیادکراوە**

١٤٢٦ کۆچی – ٢٠٠٦ ی زایینی

**ناوی کتێب:** بەئیسلامکردنی کـورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ ئاشکراکردنی هەندێ لە هەڵەکانی ئەو لێکۆڵینەوەیەی زانکۆی سلێمانی بڕوانامەی ماستەری بە پلەی نایاب پێ بەخشی.

**نووسەر:** فاضل قەرە داغی

**چاپ:** دووەم

**تیراژ:** ٢٠٠٠

**ساڵ:** ١٤٢٧ك-٢٠٠٦ز

**ژمارەی سپاردن:** ٧٠ -٢٠٠٦

**چاپی یەکەم:** ١٤٢٤کۆچی-٢٠٠٣زایینی

## ناوەڕۆك

پرۆژەی (تیشك).. ئەرك و ئامانج ..............

پێشەکیی چاپی دووەم ........................

پێشەکیی چاپی یەکەم ........................

ونکراوەکانی فتووحات ........................

شایەتەکان دەدوێن ........................

ماستەرنامەکە لەژێر تیشکدا ........................

یەکەم-ئەوەی سەرەکییە ........................

دووەم: وەکو ئیشەکانی قوتابییەکی ناوەندی ..............

١- هەڵبژاردەی کتێب ........................

٢-پەراوێزەکان بە کاملی ........................

پاشکۆ: چەند سەرچاوەیەکی تر بۆ چاپی دووەم ........

کۆتایی ........................

سەرچاوەکان ........................

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پرۆژەی (تیشك)

### ئەرك و ئامانج

بەدرێـژایی مێـژوو ململانـێ و کێبڕکێـی فیکـرو دەسـەڵات لـەنێوان مرۆڤەکانـدا هـەبووە، لـە ئاسـتی تاکـەوە تەشەنەی کردووەو کۆمەڵ و گروپ و تایەفەی گەورەی تێکەوتووەو هەندێ جاریش بەئاکامی خوێناوی کۆتـایی پێهاتووە. سەرەڕای سامناکیی ئەو ئاکامەش، بەڵام خـودی ململانێکە حاڵـەتێکی سروشـتییەو تـا ژیـان بمێنێت بەردەوام دەبێت، لەمەشەوە باری سەرنج و ڕەخنە دەوامی هەیەو وەڵامدانەوە هەر بەو پێیە بەردەوام دەبێت.

هەر کاتێکیش ڕەخنەو ڕەخنە لە ڕەخنـە بناغـەیەکی مـەوزووعییان هـەبێت ئومێد بە گەشـەکردنی هـەردوو نووسین و ئەخلاقی نووسین گەورە دەبێت، ئەو گەشەکردنەشە مرۆڤەکان دەخاتە ناو کەشـوهەوایەکی ڕۆشـنبیریی تەندروست کە نووسینی قێزەون تێیدا بە ئاسانی وەکو لەکەیەکی ڕەش جیادەکەنـەوەو نووسـینی نامـەوزووعی وەسفی شیاوی خۆی دەستدەکەوێت.

قۆنـاغی یەکـەمی پـرۆژەی (تیشـك) تایبەتـە بـە وەڵامدانـەوەی ئەو نووسـینانەی کەشـوهەوای ڕۆشـنبیرییان کردووە بە تێکەڵەی دوو شت کە ئەگەر لە هەر نووسینێکدا کۆببنەوە بێدەنگی و شکاندنی قەڵەم باشتر دەبێت لـە قسەکردن و ڕەشکردنی کاغەز. ئەو شـتەش کە بوونەتـە دەردی کوشـندەی زۆر لـە بەرهەمـە کوردییـەکان هـەر ئەو دوو شتەن کە لەکۆنترین زەمانەوە ڕاستی و چەوتییان تێکـەڵ بەیـەك کـردووەو نادروسـتیان کردۆتـە ڕاسـتییەکی بەڵگەنەویست.. زۆر بەکورتی و یەکی تەنها بە یەك وشە: (ئارەزوو) و (نەزانی).

ماوەیەکە هەرچییەك لەبارەی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی و کتێبەکەیەوە دەنووسرێت بـەو (ئـارەزوو)وەو بـەو (نەزانی)یە بەڕێوە دەبرێت. هەر لاپەڕەیەك هەڵدەیتەوە دەبینی ئارەزوویەکی لەپشـتەوەیە" ئـارەزووی ڕەفزی بـێ قەیـد و شـەرتی هەرچییەك پەیوەنـدیی بە ئیسـلامەوە هەیە، ئـارەزووی هەڵبەسـتن و گـەڕان بـەدوای هەڵبەسـتن و شاردنەوەی ڕاستییەکان، لەو کاتەش کە هێشتا (ئارەزوو) ماویەتی کارەکەی بەئەنجام بگەیـەنێت (نـەزانی) دێتـە مەیدان و دەبێتە پشتیوانێکی بەتوانا، ئینجا هەر دوو دەسـتەکە بینایـەکی سـەیر دروسـت دەکـەن" لەبنـەوە بنـاغـە نابینی و لەسەرەوە دیوارێکی لار!

ئەمـە، بـێ کـەم و زیـاد، ئـەو گیانەیـە کـە لـە بەشـێکی نووسـینە کوردییـەکانی ئـەم چـەند سـاڵەی دواییـدا دەبینیرێـت" کینەیـەکی ڕەش کـە بـێ وردبوونـەوەی قـووڵ بەشـێکی زۆری ئـەو کینەیـە پەنجـەکانی چـەند دامودەزگایەکی لەپشتەوە دەبینرێن. ئامێرەکەش کەسێکە نازناوی نووسەری وەرگرتووەو هێندەی ئەوە کینـەی هەڵگرتووە، بێگومان لەگەڵ بڕێکی زۆرتری نەزانی و نەشارەزایی.

ئەگەر پێویستیش نەکات لەبارەی (ئارەزوو) و (کینەی ڕەشی کوێرانە) کە ئیلهامبەخشـی ئـەو نووسـینانەن بدوێین، ڕەنگە پێویست بکـات، ئەگەر بـە کـورتیش بـێ، باس لـە (نـەزانی) بکـەین کە دەلیلـی نەشـارەزای ئـەو بوونەوەرە کوێرەیە:

١–لەبـەر ئـەوەی ئەو قەڵەمـە بێتوانایـە ((بۆیـان لـواوە)) زۆر کـەم خۆیـان مانـدوو دەکـەن و لـەجیاتی ئـەوەی بەرهەمی دەستی خۆیان پێشکەش بە خوێنەری کورد بکەن دەبینین دەبنە مشەخۆر بەسـەر نووسـەرانی عـەرەب و

فارسەوە، نووسینەکانی فلان و فیسارو فلانی سێیەم و فیساری چوارەم دەهێنن و لاپەڕەی زۆریان لێ وەردەگرن و لە کۆتاییدا لەو چوار سەرچاوەیە کتێبێکی دوو سەد لاپەڕەیی یان کەمتر یان زیاتر، لەگەڵ ناوی دووسەد سەرچاوەکە گوایە بەکاریان هێناون بەناوی خۆیانەوە پێکەوە دەنێن و ڕەنگە زەکاتێکی ئەو ((سامانە)) خێر بە نووسەرە ئەسڵییەکان بکەن و جارێك یان دوان یان سیان ناویان بهێنن. ئەو کەسانە هێندە نەزانن تەنانەت هەڵەی چاپیش نەقڵ دەکەن بێ ئەوەی بەو هەڵەیە بزانن.

٢-کەسێکیش ئەمە حاڵی بێ چاوەڕێی ئەوەی لێناکەی ئەو لاپەڕانەی زەوتی کردوون بە دروستی بکاتە کوردی. بەڵێ! ئەوانە هێندە نەزانن وەرگێڕانە سەقەتەکەیان زۆر جار دەتخاتە پێکەنین.

٣-کەسێك ئەوە حاڵی بێت بەڵێنی لەوە خراپتریشت پێ دەدات! ئەو کەسانە تەنانەت دەست دەگرن بەسەر بیروبۆچوونەکانی نووسەرانی عەرەب و فارس و ئینگلیزو باقی میللەتان و خۆیان لە خوێنەری کورد دەکەنە بلیمەتی فیکرو پێشەوای رای ئازاد!

ئەو کەسانە، کە زۆر لە کەناڵەکانی راگەیاندن بەوپەڕی سەخاوەتەوە نازناوی (پسپۆڕ) و (شارەزا)یان لێ دەنێن، تەنانەت زمانی عەرەبیی سادە نازانن کەچی ناوی دەیان سەرچاوەی عەرەبی فیقهی و فەرموودە و تەفسیری سەدە یەکەمەکانی کۆچی ریز دەکەن، ئەوانە تا رادەی کولەمەرگی لە زانستە ئیسلامییەکان هەژارن کەچی باسی ئاڵۆزترین بابەتی ئەو زانستانە دەکەن، هەگبەکەش، گەر بیپشکنی، زۆر لەوەش بەتاڵترە، بەرهەمەکانی ئەم پرۆژەیەشمان ئەو راستییە دەسەلمێنن.

لەکۆتاییشدا بە خوێنەری کورد رادەگەیەنین کە هەرچەندە پرۆژەی (تیشك) پرۆژەیەکە کۆمەڵێك نووسەر دایانمەزراندووە کە ئەرکی وەڵامدانەوەی هەندێك لەو نووسینانەیان گرتۆتە ئەستۆ، بەڵام دەرگای بۆ هەموو نووسەرێك واڵا کردووە و بەشداریکردن لە پرۆژەکە بە (ماف) نازانێ بەڵکو بە (ئەرك)، ئەرك بەرامبەر ئایین و بەهاکانی و ئەرك بەرامبەر کوردستان و خەڵکە موسڵمانەکەی، بێ ئەوەی لەبیرمان بچێت کە ئەو ئەرکە بەرامبەر خوێنەری کورد، هەر بیروباوەڕێکی هەبێت، ئەرکی گەیاندنی زانیاریی راست و ئاشکراکردنی هەڵبەستن.


**ئەندامانی پرۆژەی (تیشك)**

**فازل قەرەداغی، ئیکرام کەریم، تۆفیق کەریم، بەکر حەمە صدیق، حەسەن مەحمود حەمەکەریم، دکتۆر عەبدولکەریم ئەحمەد، هاوژین عومەر**

tishkbooks@yahoo.com

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکیی چاپی دووەم

دوو ساڵو نیو بەسەر چاپی یەکەم ئەم کتێبەدا تێپەڕیوە. دوو ساڵو نیوە زانکۆ لە خاوەنی ماستەرنامەکەی نەپرسیوەتەوە، نەداوای لێکردووە ماستەرنامەکەی چاك بكات (کە ئەمە زەحمەتە)و نەداوای وەڵامێکی لێکردووە. دوو ساڵو نیویشە خاوەنی ماستەرنامەکە دەڵێت وەڵام دەنووسم بەڵام کەس هیچی نەبینیوە.

نازانم لە زانکۆکانی جیهاندا زانکۆ لەو حاڵەتدا چی دەکات. بەبڕوای خۆم دەبێت بڕوانامەکە لەو کەسە بسەنرێتەوە ئەگەر نامەکە ئەو هەموو هەڵەو ئەو هەموو ساختەکارییانەی تێدا بێت کە لە ماستەرنامەکەی کاك (شوان)دا هەبێ، بەلای کەمیشەوە دەبێت ناچار بکرێت نامەیەکی تر بنووسێت یان ئەو نامەیە سەرلەنوێ بنووسێتەوە.

زانکۆی سلێمانی نەك تەنیا هیچ شتێکی لەمانە نەکردووەو نەك تەنیا گوێی خۆی لێ کەڕ کردووە بەڵکو لەوە خراپتر ئەوەیە خەڵاتی کاك شوانی کرد بەوەی لە خوێندنی دوکتۆرا وەریگرتووە!![1]

بەم جۆرە زانکۆ بە قبووڵ کردنی ئەو خەڵەتاندنە نەوەستاوە بەڵکو ئەو ئیهانەیەشی قبووڵ کرد کە بە کەرامەتی خۆی کرا. من لە چاپی یەکەمدا ئافەرینم لە کاك شوان کرد کە توانی سەرپەرشتیاری خۆیو سێ دوکتۆری موناقیشیو هەموو زانکۆکەی خەڵەتاند، دیارە زانکۆش ئەوەی بە بلیمەتی زانیوەو لەسەر ئەساسی ئەم بلیمەتییە بڕیاری دا کاك شوان شایەنی بڕوانامەی دوکتۆراشە!

چاپی یەکەم تەنها سێ سەد دانەی لێکرا بەڵام دەنگێکی زۆری لە زانکۆ دایەوە چونکە هێندەی بزانم یەکەم پرۆژەی جیددی رەخنە لە دەزگایەك بوو کە بە ئەکادیمی ناسرابوو. بە کارێکی سەرکەوتووشی دەزانم ئەگەر توانیبێتم گومان بخەمە دڵی قوتابیان، گومان لە زانکۆو مامۆستاکانیانو ماستەرنامەو دوکتۆرانامەکانیان، ئەو گومانەشە، ئەگەر بە رەوتێکی دروستدا بڕوات، دەبێتە هەوێنی رەخنەی زۆرتر.

لەم چاپەدا نووسینەکەم وەکو خۆی هێشتووەو هەندێك شتی دیکەم زیاد کردووە، یەك لەوانە سێ سەرچاوەی ئینگلیزی کە کاك شوان لە کتێبێکی عەرەبی ((بردوونی))، یەکێکیش لەوانە بۆ نوکتە خۆشە چونکە لەجیاتی ئەوەی سەرچاوەی ئینگلیزیی (ا) ببات لێی تێکچووەو (ب)ی بردووە.

ئینجا ئەگەر ماوەی باشم هەبوایەو پرۆژەی نووسینم ترم لەبەردەستدا نەبوایە لەوە زۆرترم زیاد دەکردو بەشێوەیەکی عەمەلی دەمسەلماند کە ماستەرنامەکەی کاك شوان بەهەشتی رەخنەگرانە. بەڵام هەموو ئەمانە لەلایەكو ئەو بەڵێنەی دابووم کە بەزووترین کاتە ئەم چاپە دووەمە وەکو یەکەم بەرهەمی پرۆژەی کتێبی رەخنەیی ئامادە بکەم دەستیان بەستمەوە. وەکو لە چاپی یەکەمیشدا نووسیبووم" زۆرم بۆ خەڵکی تر جێهێشتووە.

---

[1] دەزگایەکی کوردیی کەرکووك خەڵاتی یەکەمی (مەلا جەمیل رۆژبەیانی)ی بە کتێبەکەی کاك شوان دا. رواڵەتو گونجانی بیروبۆچوونو ئایدیۆلۆجیا بەسە بۆ بەخشینی خەڵات.

## پێشەكیی چاپی یەكەم

ئەم كتێبە بچووكە لە ئەسڵدا بەشێكە لە كتێبێك بە ناوی (چەرخی زێڕینی نەخوێندەواری) كە چەند بەشێكم لێ نووسیوەتەوەو بەباشم زانی ئەم بەشە پێش بخەم. لەو كتێبەدا ژمارەیەكی زۆری هەڵە ، بگرە قسەی بێ سەروبنم كۆكردۆتەوە كە نووسینە كوردییەكانی پڕكردۆتەوە. لەم سەردەمە زێڕینەی نەخوێندەوارییەدا لەجاران زیاتر شت دەنووسرێن بەڵام بۆشایی نێوان ڕۆشنبیریی كوردیو ڕۆشنبیریی جیهانی بەردەوام لەگەورەبووندایە. عەیبیش نییە بۆ مرۆڤ شت بنووسێتو لە نووسینەكانیدا ژمارەیەك هەڵە بكات ، هەمووومان هەڵە دەكەین، بەڵام كێشە ئەوەیە مرۆڤ شتی بێ بناغەو بێ سەرو بن بنووسێت هەروەكو ئەوانەی دوو یان سێ كتێبی لاواز دەخوێننەوەو سەد شتی خەیاڵی خۆیان دەخەنە پاڵ ئینجا بابەتێك لەم تێكەڵە سەیرە دێننە بەرهەم، كارێكە نموونەی زۆرم لێ دیوەو بەتایبەتی لە دوو بواردا" یەك: مێژووی كۆنی كوردستان، دوو: ئیسلامو فیكرو مێژووی ئیسلامی.

ماستەرنامەكەی شوان عوسمان شتێكی ترە. ماستەرنامەكە بەڕووكەش دەیان سەرچاوەی قەڵەو(بەڵام هەروا دەیانی تری زۆر لاواز)ی ڕیزكردووە بەڵام بەشێوازێك نووووسراوەتەوە كە بۆی سەلماندم گیانی ئەم چەرخی نەخوێندەوارییە بەبێ كێشە گەشتۆتە ئاستی خوێندنی باڵا.

چوار ساڵی خوێندنی ١٩٧٩-١٩٨٠ تا ١٩٨٢-١٩٨٣ قوتابیی كۆلێجی ئەندازیاریی زانكۆی سلێمانی بووم. دوو ساڵی دوایەمینی خوێندنم زانكۆ بۆ هەولێر گوازرایەوەو خوێندنەكەم لە زانكۆی سەلاحەددین تەواو كرد. بەم جۆرە شارەزای ئاستی خوێندنی زانكۆكە بووم كە ئەو كاتە سەردەمی هەرزانیو توانای ماددیی گەورەی حكومەتی عیراق بووو حكومەت مامۆستای لە دەرەوە، بەزۆری لە هندستان، دەهێناو ئەمانە توانایەكی تاڕادەیەك باشیان هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئاستی خوێندن لە زانكۆی سلێمانیو دواتر سەلاحەددین نزمتربوو لە هی زانكۆكانی تر. لەمەشەوە دەتوانین شتێك لەبارەی ئاستی نزمی خوێندن لەم دە ساڵەی دواییدا بزانین.

كاتی خۆی كۆمەڵێ شت خوێندنی قوتابیانی دوادەخست" یەك: زانكۆكە بە گشتی لێوەشاوە نەبوو، دوو: حزبایەتی كە بەعس پیادەی دەكرد، سێ: باری نائارامیی كوردستان ، چوار:قوتابیان كاتێكی باشی خۆیان بە پەیوەندیی كوڕو كچەوە دەبردە سەر.

لەو دە ساڵی دوایی ئەو شتانەی خوێندن دوادەخەن زۆرترو خراپتربوون. جگە لەهەموو ئەمانەش كاتی خۆی ئەو پارەیەی قوتابی وەریدەگرت بەشی لایەكی گەورەی مەسرەفی دەكرد لەكاتێكدا زۆر لە قوتابیانی ئێستا ناچارن زۆرانبازی لەگەڵ ژیان بكەن پێش ئەوەی بیر لە زاڵبوون بەسەر وانەكاندا بكەنەوە. دواتریش كە بڕوانامەكە وەردەگرن دەرگاكانی ژیان بەتەواوی لەڕوویاندا دادەخرێن.

ئا لەم وەزعەی هیچی لەگەڵ پێوانەكانی خوێندن یەك ناگرێتەوەو لەجیاتی چاككردنی ئەم بارودۆخەی خوێندن بیر لە شتی تر دەكرێتەوە كە یەكێكیان بەكارهێنانی زانكۆیە بۆ سەپاندنی هەندێك ڕەوتو بیروڕا وەكو ئەوەی ئەم ماستەرنامەیە مەبەستی بوو. بێگومان عەقڵ حزبییانە بیربكاتەوەو بابەتی ماستەرنامە بۆ مەبەستێكی حزبیو ئایدیۆلۆجی هەڵبژێردرێتو ئاستی خوێندن وا نزم بێتو ئاستی خوێندەواری لە كوردستاندا بەگشتی لەوە نزمتر بێتو لە زانكۆدا دكتۆر شەق لە فەرمانبەر بداتو مامۆستا لە مامۆستای تر هەڵبدات.. ئەگەر ئەمانەو لەمانە زیاتر لە زانكۆدا بكرێن بوار بە ئاسانی دەڕەخسێت بۆ خاوەنی ماستەرنامە فێڵ بكاتو نامەیەك بنووسێت بەس بێت بۆ لەكەداركردنی هەر قوتابخانەیەك، نەك زانكۆ، لێكۆڵینەوەكەی پەسەند بكات. ئیتر بزانە ئەوە چۆن ماستەرنامەیەكە خاوەنەكەی ناوی چەندین كتێب وەك سەرچاوە بنووسێت بەمەرجێ چاوی پێیان نەكەوتبێتو دەیان زانیاری بە هەڵە نەقڵ بكاتو لە ژمارەیەكی تریان تێنەگاتو..جارێ با پەلە نەكەین، كاتی باسكردنی ئەمە دێت.

* * * * * * * *

ڕۆژی ٢٠٠٢/٥/١٤ [٢] لە موناقەشەی ماستەرنامەی (کوردستان و پرۆسەی بەئیسلام کردنی کورد) – کە پلەی نایابی پێ بەخشرا ئامادە بووم [٣]. لەو ڕۆژەشدا ئەو ڕاستییەم بۆ دەرکەوت کە ناتوانین بەتەواوی پشت بەو بەرهەمانە ببەستین.

(شوان عوسمان مستەفا)، خاوەنی نامەکە کەسێکی موجامەلەو پێی خۆشە نامەکەی بەهەوڵێکی دژایەتی کردنی ئیسلام نەزانرێت و وەکو قوتابییەکی زانکۆ دەڵێت هەڵوێستی بەرامبەر بەئیسلام باشە. بەڕاستی ئەم هەڵوێستە تەواو پێچەوانەی زۆر لەو قسانەی لە لێکۆڵینەوەکەیدا وتوونی. بێبەختیی کاک شوانیش لەوەدایە دکتۆر نەبەز مەجیدی سەرپەرشتیاری ئەم بابەتەی بەدڵ بووەو دیارە سووربوونی ئەو بوو لەپشتی هەڵبژاردنی بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیەو شێوازی نووسینەوەیو ئاڕاستەی بیروبۆچوونەکانی ناوی بوو.

بۆچی بەتەواوی باوەڕ بە ماستەرنامەو دکتۆرانامە نەکەین کە لە هەلومەرجی وەکو ئەوانەی ماستەرنامەکەی شوان بەرهەم هێنرابێت؟ چونکە ئەو مامۆستایانەی موناقەشەی نامەکان دەکەن بۆ خۆیان قوتابییان هەیەو لەداوڕۆژدا دەکەونە بەر ڕەحمی ئەو مامۆستایەی کە بۆی هەیە ببێتە موناقشی نامەی قوتابییەکەی ئەوان. بەم جۆرە موجامەلە زۆر پێویست دەبێت.

لیژنەی ((موناقەشەکە)) لە سێ دکتۆری زانکۆی سلێمانی پێکهاتبوو: دکتۆر حسام الدین نەقشبەندیو دکتۆر کاوس قەفتان و دکتۆر کەمال عەلی. تەنها یەکەمیشیان لە مێژووی ئیسلامی پسپۆڕەو تەنها ئەو بوو موناقەشەیەکی دوورودرێژی کرد لەکاتێکدا سێیەمیان هیچ موناقەشەیەکی نەکردو تەنها ئەو شتانەی دووبارە دەکردەوە کە لە ماستەرنامەکەدا وتراون بەڵام بەشێوازی پرسیار : بۆچی..؟ ئایا..؟ لەبەرچی..؟ دووەمیشیان دەنگی نزم بووو ئەوانەی لە پشتەوە دانیشتبوون هیچی لێ حاڵی نەبوون.

دکتۆر حسام الدین موناقەشەی زۆری کرد بەڵام سەرەڕای ئەوە وتی: من ئامادەی موناقەشەی نامەی زۆری ماستەرو دکتۆرا بوومو هیچیان شایەنی ئەو بڕوانامەیە نەبوون کە پێیان دراوە بەڵام ئەم لێکۆڵینەوەیە شایەنی بڕوانامەی نەک تەنها ماستەرە بەڵکو دکتۆراش!

داوام لەخوێنەرە پاش تەواوکردنی ئەم ڕەخنەیەم جارێکی تر ئەم ڕستانە بخوێنێتەوە. خوێنەر دوایی ئافەرین لەکاك شوان دەکات کە چۆن توانی زانکۆیەکەو سەرپەرشتیاری خۆیو سێ دکتۆر بخەڵەتێنێت، پاشان هەر خوێنەر خۆی دەپرسێت: ئەی حاڵی ئەو ماستەرنامەو دکتۆرانامانە چی بێت کە د. حسام الدین لێیان ڕازی نییە؟

ڕەخنەکەمان دوو تەوەرەن:

١ – ((بەئیسلام کردنی کورد)) نەک تەنها نارێکە بەڕاستییە مێژووییەکان بەڵکو بەزانیاریی تری ناو ماستەرنامەکەشو ئەمە بەسە بۆ لەبەریەك هەڵوەشاندنی هەموو نامەکە.

٢ –ئەمانەتی زانستی لەزانیاریو سەرچاوەکاندا نەپارێزراوە " ژمارەیەك سەرچاوە نووسراون کە شوان هیچی نەدیون یان زانیارییەکی وتووە کە لەو سەرچاوانەدا نەهاتووە، یان سەرچاوەکە شتێك دەڵێت بەڵام کاك شوان شتێکی تر دەنووسێت.. تاد.. تاد.

ماستەرنامەکە پڕێتی لە سەرچاوە بەڵام کاك شوان وەك وتم ژمارەیەك لەمانەی نەدیوەو دیارە زانیارییەکان لە سەرچاوەی ترەوە نەقڵ کردووە، ژمارەیەکی دیکەی سەرچاوەکانیش بۆ بابەتەکەی شوان زۆر لاوەکینو ناوبردنیان زیادەیە.. [٤].

---

[٢] لە قوتابییەکی بەشی مێژووم داواکرد بە کاك شوان بڵێت دەعوەتنامەیەکەم بداتێ ئەویش بۆی ناردم.

[٣] ماستەرنامەکە هەمان ساڵ لە سلێمانی لەچاپدرا.

[٤] شوان (ل٤) باسی نووسینی تری کوردی لەبارەی بەموسڵمانبوونی کورد دەکات و یەکێك لە ڕەخنەکانی ئەوەیە هەیانە لایەنگیرانە ونازانستیو نائەکادیمییانە نووسراونەتەوە. کاك هیوا سەلام لە کتێبەکەیدا (کە لەبەر سەرقاڵیم بەم نووسینەم تەنها چەند لاپەڕەیەکی جیاجیام لێ خوێندەوە) :کورد لە نێوان بەئیسلام کردن وئیسلام بووندا،نووسینگەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠٠٣و کە ڕەخنەیە لە ماستەرنامەکەی شوان ئەو قسەیەی شوان دەهێنێتەوەو دەڵێت قسەکەی ئەوە دەگەیەنێت کە کتێبی حەسەن مەحموود حەمە کەریم"(کوردستان لەبەردەم فتووحاتی

تێبینییەکیش لەسەر نووسینی ئەم ڕەخنەیەی خۆم: هەر لەسەرەتاوە نیازم نەبوو لەسەر هەموو کتێبەکە بدوێم چونکە کارێکی وا کتێبێکی دەوێت لەوەی کاك شوان گەورەتر. دەرخستنی فێڵەکانو هەڵەکانو خراپ حاڵی بوونەکان.. تاد کاتێکی زۆری پێویستەو باقی کتێبەکە بۆ ڕەخنەگری تر جێ دەهێڵمو ڕەخنەگر دڵنیا دەکەم شتی زۆری دەست دەکەوێت چونکە کتێبەکەی شوان بەهەشتی ڕەخنەگرانە.

حەزیش دەکەم بەرلەوەی دەست بدەمە کتێبەکەو نەشتەرگەرییەکی هەندێك بەشی بکەم باسێکی فتووحاتی ئیسلامی بکەم.

## ونکراوەکانی فتووحات

ئەگەر ئەو باسو کتێبە کوردییانەی دەخرێنە بەردەم خوێنەر ببنە تاکە سەرچاوەمان لەبارەی فتووحاتی ئیسلامییەوە جەهلو نەزانی بەشمان دەبێت.

نەشارەزایی یان زانیاریی کەم لەبارەی مێژووی ئیسلامی ڕێگەی بە وڕێنە داوە ببنە ڕاستی، ڕاستییەکانیش ون بنو خوێنەر ئاگای لە زۆریان نەبێت. وشەی (ونکراوەکان) کە بەکارم هێناوە زێدەڕۆیی تێدایە چونکە وشەکە مانای وایە ئەوانەی لەسەر فتووحات دەنووسن شت دەزانن بەڵام دەیشارنەوە لەکاتێکدا باوەڕم وایە ئەمان ئەو شتانە نازانن یان کەمێکی دەزانن.

نەزانی وشەیەکە خۆی خۆی تەفسیر دەکات، لەلایەکی ترەوە باس نەکردنی ئەو شتانەی زانراون نیفاقێکی ڕۆشنبیرییە چونکە وای لێهاتووە نووسەر(جگە لە کەسانێکی کەم کە ئەو تەقلیدەیان شکاندووە) بەباشی باسی ئیسلامو شارستانیەتی ئیسلامیو مێژووی ئیسلامی نەکات نەوەکو سومعەی بڕووشێتو گومان لە مۆدێرنێتیو پێشکەوتنخوازییەکەی دروست ببێت. بەڵام ئەمە مۆدێرنێتییەکی ساختەیە" هی چەرخە زێڕینەکەی نەخوێندەواریی کوردستان.

لەم بەشەدا چەند شتێکی فتووحاتی ئیسلامی باس دەکەم کە لەو باسو کتێبە کوردییانە ونکراون، ئیتر یان بەدەستی ئەنقەستو یان لە بێئاگاییەوە. خوێنەری کورد پێویستی بەو زانیارییانە هەیە تا وێنە کاریکاتێرییەکە ڕاست بێتەوە، ئەو وێنەیەی هەردوو دەمارگیریو نەزانی نەخشاندوویانە. ئەوەی خوارەوەش تەنها باسێکی کورتە چونکە ئێرە جێی لێکۆڵینەوەیەکی دووروودرێژ لەبارەی فتووحاتی تێدا نابێتەوە.

بەر لەهەموو شتێك پێویستە بزانین کە فتووحاتی ئیسلامی کۆمەڵێك بەسەرهاتن لەمێژوودا دەگمەن نین بەڵکو بەدرێژایی مێژوو ڕوویان داوە. ئینجا ئەگەر ئیسلام لەکوردستاندا سەری هەڵبدایەو فتووحات بەلەشکری کوردی بکرایە، ئەمڕۆ هەر ئەوانەی فتووحات خراپ دەنرخێنن شانازییان پێوە دەکردو باسیان لەئیمپراتۆریەتی خاوەن شکۆی کورد دەکرد.ئەوەتا ئەوەی هەیەو نییە دەوڵەتی میدیایە کەبەشی خۆی وڵاتانی داگیرکردبوو جێگەی شانازییەو ئەمانە دەڵێن

---

ئیسلامیدا) زانستیو ئەکادیمی نییە(ل١٠١). هەرچەندە تا ئێستا کتێبەکەی کاك حەسەنم نەخوێندۆتەوەو بۆیە ناتوانم مەوزووعیانە حوکمی لەسەر بدەم بەڵام دەبوا کتێبێکی گەورە لەسەر هەمان بابەتی ماستەرنامەکەی شوان کەمێك سوودی لێ وەربگیرایە ئەگەر بۆ ڕەخنەلێگرتنیش بوایە کەچی شوان یەك جار بەسەرپێی ناوی دەبات.کاك شوان لەجیاتیی ئەوە ناوی زۆرکتێبی لایەنگرانەو نازانستی دەنووسێت. هیواداریشم خوێنەر پاش تەواوکردنی خوێندنەوەی ئەم ڕەخنەیەمان قسەکەی کاك شوان لەیاد مابێت سەبارەت بەو نووسینە لایەنگرو نازانستی ونائەکادیمییانەو حوکم بدات نووسینەکەی کاك شوان لەکامەیانە.

ئێمە نەوەی ((میدیاو کەیخەسرەوین))؟ ئەمە کێشەیەکە نەتەوەگەرایی بۆی چارەسەر ناکرێت: شانازی کردن بە ڕابوردوو هەتا ئەگەر داگیرکاریشی تێدا هەبووبێت بەڵام ڕەفزکردنی داگیرکاریی دوژمنان. کێشەکە لەوەدایە نەتەوەگەرایی جێگەی هەموو نەتەوەکانی تێدا نابێتەوە لەکاتێکدا لەئایینگەرایی (جگە لە چەند حاڵەتێك) دەرگای وەرگرتنی ئایینەکە بۆ هەموو نەتەوەیەك و ئایینێك کراوەیە.

شەڕی داگیرکاری لەکۆنەوە، وەك زۆر خوێنەر دەزانێت، هەر هەبووو تائەمڕۆ ماوەو نوێترین نموونەی ڕۆژئاوایە کە دەسەڵاتدارانی لەهەموو دەسەڵاتدارێکی جیهان زیاتر باس لەئازادی دەکەن لەکاتێکدا وڵاتانی زیاتریان داگیر کردبووو دواییش شێوازی نوێی داگیرکارییان داهێنا، ئەو مێژووە بێگومان لای ئەوانیش جێگەی شانازییە.

ڕاستییەکی تر ئەوەیە مەبەستی فتووحاتی ئیسلامی سەپاندنی ئاینی ئیسلام نەبوو. دانانی سێ ئیختیار لەبەردەم غەیری موسڵمانان ((موسڵمان بوون یان جزیەدان و مانەوە لەسەر ئاینی خۆیان و یان شەڕ)) ئەمە ڕەت دەکاتەوە. بێگومان وەکو ئەو شەڕانەش نین کە لاپەڕەکانی مێژوویان پڕکردۆتەوەو یەکێك لە مەبەستە سەرەکییەکانیان شکۆمەندیی پادشاکان بوو. کۆچی گەلانیش نەبوون. بڕیاردانیش لەسەر ئەنجامدانی فتووحات بۆ دەستکەوتی ماددی نەبوو (بڕوانە خوارەوە). بەکورتی فتووحاتی ئیسلامی گیانێك دەیجووڵاند کەخوێندنەوەی مێژووو شارەزایی پەیدا کردن لەبارەی ئیسلامەوە ڕێگەیەکن بۆ ناسینی.

بەڵام خوێنەری کورد چۆن ئەو گیانە بناسێت لەکاتێکدا نە سەرچاوە ئەسڵییەکان دەخوێنێتەوەو نەباس و کتێبە کوردییەکان وێنە تەواوەکەی پێشکەش دەکەن؟ بەڵام ئایا سەرچاوە کوردییەکان وێنەی تەواو لەبارەی مێژووی کوردستان (بەتایبەتی مێژووی کۆنی) پێشکەش دەکەن تا ئەمە بۆ فتووحات بکەن؟ ئەمانە بەزۆری شتی سۆزدارو نازانستی لەخۆدەگرن. زۆر لەمانە تەنها ئەوە دەزانن بڵێن ئیسلام ئایینی عەرەبە بەڵام کورد ئایینی خۆی هەبووە کە ئایینی زەردەشتییە. ئەم قسەیەش بەتەنیا بەسە نەك هەر مێژووی ئیسلامیش بشێوێنێت بەڵکو هی میللەتانی کوردستان و ئێران و ئەفغانستان و بەلووچستانیش تەسلیم بە قسەی ساویلکەو نازانستی بکات.

مادەم باسی فتووحاتی ئیسلامیش دەکەین شتێکی زیادە نابێت ئەگەر بڵێین کە ئەوانەی بۆ ئایینی زەردەشت دەگرین نازانن ئەو ئایینە بەپێی ڕیوایەتەکان دەوڵەتێك لە ڕۆژهەڵاتی ئێران لە پشتیەوە بووو هەر لە ژیانی زەردەشتدا ئەو دەوڵەتە شەڕی لەپێناوی ئایینەکە کردبووو تەنانەت یەکێك لە ڕیوایەتەکان دەڵێت زەردەشت لە شەڕێکی وەهادا کوژراوە، واتە ئەگەر زەردەشت بەڕاستی پێغەمبەرێکی ئاسمانی بووبێت (کە ئەمە قەناعەتی خۆمە) [٥] و ئەگەر ڕیوایەتی کوژرانی ڕاست بێت دەبێ بڵێین زەردەشت پێغەمبەرێکی موجاهید بووەو لەپێناوی ئایینەکەیدا شەهید بووە!

* * * * * * *

یەکێك لە شتە زانراوەکانی مێژوو ئەوەیە داگیرکەران بەزەییان لەگەڵ خەڵکی وڵاتە داگیرکراوەکاندا نەنواندووە، هەر وڵاتێکیش هەڵگەڕابێتەوە زۆر سەختتر لەجاران مامەڵەی لەگەڵدا کراوە. نموونەکانی بەکارهێنانی توندوتیژی دژی خەڵکی وڵاتە فەتح کراوەکانی سەردەمی فتووحاتی ئیسلامی زۆر کەمترن لەچاو داگیرکارییەکانی مێژووو زۆر کەمتریشن لەسەرجەم چالاکییە سەربازییەکانی فتووحات[٦].

---

[٥] بەڵگەی باش هەن لەسەر ئەوەی ئایینی زەردەشت ئایینێکی ئاسمانییەو دواتر دەستکاری کراوەو (شرك)ی تێکەوتووە، بواریش نییە لێرەدا لەسەر ئەمە بڕۆم. ئەوانەش بۆ ئایینی زەردەشت دەگرین نە پوختیی ئایینەکەیان مەبەستەو نەڕێنماییە ئەخلاقییەکانی بەڵکو زۆربەیان هیچ نازانن غەیری ئەو قسەیەی دەڵێت زەردەشت پێغەمبەری کورد بووە کە ئەمە قسەی سەرجادەیە چونکە نە وڵات و ڕەچەڵەکی زەردەشت تا ئێستا ساغ بۆتەوەو نە کوردیش لەو سەردەمەدا وەکو کورد پەیدابیبووو تەنها دەتوانین بڵێین میللەتانی ئەوسا بناغەیەکی کوردبوون و کورد لەمان و لە میللەتانی تر دروستببوو ئەویش لە سەردەمێکی دیاریکراو کە بەئەکیدی سەردەمی زەردەشت نەبووە.پاشان تێکەڵکردنی ئایینی زەردەشت بە ناسیۆنالیزم شێواندنی پەیامەکەیەتی،ئەو پەیامەی ئەمان هیچی لەبارەوە نازانن.

[٦] شوان دەنووسێت: ((کاردانەوەی لەشکری عەرەبە موسڵمانەکان زۆر توندوتیژ بوو بەرامبەر خەڵکی هەر شارێکی هەڵگەڕاوە)) (ل٢٤٥پەراوێزی٢). شوان بۆ ئەمە ناوی دوو سەرچاوەی کۆن دەنووسێت، یەکێکیان کە دەستم کەوتووە مێژووەکەی خەلیفە کوڕی خەییاتە، هەرچەندە شوان ئاماژەی بۆ ڕووداوەکە نەکردووەو هەرچەندە چاپەکەی لای خۆم جیاوازە بەڵام نزیك لەو لاپەڕەی ئاماژەی بۆ کراوە ڕووداوێك

ئەوەندەشم لەبارەی فتووحاتەوە خوێندووە نموونەم نەدیوە لەسەر ڕووخاندنو سووتاندنی شارێك تەنها نموونەی ڕووخاندنی قەڵایەك کە لەبەرامبەر ناوچەکانی ژێر دەستی ڕۆمدا بوو، واتە لە بەرەی پێشەوە بوو، ئەمە لەکاتێکدا ڕووخاندنو سووتاندنی شارو گوندەکان، ئەوانەی یەکەم جار گیرابوون یان ئەوانەی یاخی ببوون، کارێکی زۆر ئاسایی شەڕەکانی تر بووە. ئەوەتا پادشای ئاشوری" ئاشور ناصرپالی دووەم کە دێتە ناوچەی سلێمانی وپیرەمەگروونو شارەزوور.. (٨٨١و ٨٨٠ ی پێش زاین) وەکو هەموو پادشا کۆنەکان شانازی بە کوشتارو شارو گوند سووتاندن دەکات: ((سەرەکانیان (= سەری کوژراوەکانیان)م بە قەدی درەختەکاندا بەست، کوڕو کچەکانیانم بە ئاگر سووتاند)) [7] یان باسی چەند شارێك دەکات کە ((لەگەڵ ١٥٠ شار (یان گوند)ی دەوروبەریانم ڕووخاندو وێران کردو سووتاندمنو کردمن بە تەپۆلکەو وێرانە)) [8]. یان بۆچی دوور بڕۆین؟ ئەوەتا هیرەقل، ئیمپراتۆری بیزەنتی چەندساڵێك بەر لەوەی ئیسلام بگاتە کوردستانو لەمیانەی شەڕەکەی دژی فارس پەلاماری ئەوێی دا بووو مانگی شوباتی ساڵی ٦٢٨ی زایینیی لە شارەزووردا بردە سەرو لەوێدا چی هاتە بەردەستی لەگوندوشار وێرانی کردو سووتاندنی [9].

خۆ ئەگەر باسی سەردەمی دیموکراسی بکەین هیرۆشیماو ناگازاکی دوو نموونەی زۆر باش زانراونو شتی زۆرتر هەن ئەوەندە ناودار نین هەروەکو (بۆردومانی ستراتیجی) کە بۆ شارە ئەڵمانییەکان خرایە کارو زیاد لە ٦٠٠ هەزار ئەڵمانی لە شارە جیا جیاکانی ئەڵمانیا بە بۆردومانی فڕۆکە بەریتانیو ئەمەریکییەکان کوژرانو تەنها لە شاری دریسدن ژمارەی کوژراو زامدارەکان گەشتە ٨٠ تا ١١٠ هەزار هاوڵاتی [10].

بەشی گەورەی جەنگەکانی مێژوو هۆی ئابوورییان لەپشتەوە بوو بۆیە فتووحات بەهەمان چاو تەماشا کراون.نکوڵی لەوەش ناکرێت کەسانێك هەبوون لەناو لەشکری موسڵمانان بەمەبەستی دەستکەوت بەشداریی شەڕەکانیان کردبوو بەڵام نابێت لەم ڕاستییانە بێئاگابین:

١-موسڵمانان دژی دوو دەوڵەتی گەورەی ئەو سەردەمە شەڕیان دەکردو شەڕی ئەم دوو دەوڵەتە وەکو شەڕی ناوخۆی کاتی جاهیلیەتی خۆیان نەبوو، لەوەزعێکی وەهاشدا تەماعی دەستکەوتی ماددی کەمترە مەگەر لە هەندێ قۆناغدا کە شەڕەکە ئاسانتر بووە، ئەمە شەڕە یەکەمەکان، بەتایبەتی دژی ساسانییەکان ناگرێتەوە کە زۆر سەخت بوون.

٢-سەرکردەی لەشکرەکان بەزۆری صەحابی بوونو ئەمانە بەحوکمی پەروەردە ئیسلامییەکەی لەسەر دەستی پێغەمبەر ρ وەریانگرتبوو خواناستر بوونو ڕێگەیان بەکاری ناڕەوا نەدەدا.

٣-دەستکەوتەکان دەکرانە پێنج بەش کە چوار بەشیان بەسەر شەڕکەرەکان دابەش دەکران، واتە بەشە گەورەکەیان بەردەکەوت. ڕەخنەگران یەك لای مەسەلەکە دەبیننو دەڵێن ئەوەتا ئەمانە بۆ دەستکەوت هاتبوون بەڵام ئەمە بەراورد ناکەن لەگەڵ لەشکری دەوڵەتانی مێژوو کە بەزۆری سەربازەکان بەزۆرەملێو بەمووچەیەك ڕاپێچی شەڕ دەکران.

دەمێنێتەوە نموونە لەسەر دەستپاکیی موسڵمانان بهێنینەوە تا ئەو گیانە بناسین کەئەو خەڵکەی جووڵاندبووو درۆی قسە ساکارەکەی دەڵێت: ((ئەمان بەتەماعی تاڵانی شەڕیان کردبوو)) ئاشکرا بکرێت. وەکو وتیشمان کەسانێك هەر

---

هەیە کە ئەو سەنەدەی خەلیفە پێی دەگێڕێتەوە نایگەیەنێتە ئاستی روایەتی باوەڕپێکراو. شوان لە دەیانو سەدان رووداوی فتووحات تەنها ئەو نموونەیەمان بۆ دەهێنێتەوە، کەچی بەو شێوە گشتگیرەی سەرەوە باس لە کاردانەوەی توندوتیژ دەکات، ئەمەش نیشانەیەکە لەسەر گیانی تەزویر کە خۆی بەسەر عەقلیەتی هەندێك نووسەری خۆمان سەپاندووە.

[7] D.D.Luckenbill, Ancient Records of Babylonia and Assyria, vol.1, 1926, S 450.

بڕوانە هەروەها کتێبەکەمان: لێکۆڵینەوەی فیکری وسیاسی (٢٠٠٠)، ل٩٤. سەبارەت بەو دوو لەشکرکەشییەی ئاشورناصرپالیش بڕوانە کتێبەکەی ترمان: مێژووی گەلی لوللو (١٩٩٨)، ل٣٥ بەدواوە. ئەگەر هیچیش نەخوێنینەوە تەنها مێژووی کۆنی کوردستان نەبێت جیاوازییە گەورەکەی فتووحاتی ئیسلامی لەگەڵ فتووحاتی دەوڵەتانی دیکەمان بۆ دەردەکەوێت.

[8] Ibid., S 455.

[9] محمد امین زکی، خلاصة تاریخ الکرد وکردستان، ل١٢٠. هەروەها دائرة المعارف الاسلامیة، ج١٣، ل٤٢٠. ئەمین زەکی چاپێکی تری بەکارهێناوە.

[10] ر. پارکنسن، موسوعة الحرب الحدیثة، ج٢، ل٥٧٥.

هەبوون بەو مەبەستە چووبوونە ڕیزی سوپاکە، هەرکاتێکیش مەلائیکەت بەتەنیاو بێ مرۆڤ شەڕیان کرد ئینجا با باس لەمەبەستی دوور لەنیازی سوودو دەستکەوتی ماددی بکەین.

(تەبەری) لەمێژووەکەیدا لە زمانی جابر کوڕی عەبدوڵلای صەحابی دەگێڕێتەوە کەجابر سوێند دەخوات و دەڵێت کەسمان نەدەناسی و نەدەزانی لەوانەی لە لەشکری (قادسییە) بەشدارییان کردووە کە لەگەڵ ئاخیرەتدا دنیای مەبەست بێت، ئێمە گومانمان لەسێ کەس کردبوو کەچی وەکو ئەمانەت و زوهدی ئەوانمان نەدی، ئەو سێ کەسەش (طولەیحە کوڕی خوەیلد)و (عەمر کوڕی مەعدیەکروب)و (قەیس کوڕی ئەلمەکشووح)[11].

(سەعد کوڕی ئەبو وەققاص)یش شایەتی بۆ دەستپاکیی سوپاکە دەدات و دەڵێت ئەگەر بەشداربووانی شەڕی (بەدر) ئەو فەزڵەیان نەبوایە[12] دەموت لەوانەی شەڕی بەدر ژمارەیەك خەتای بچووکم بینیبوو کە بڕواناکەم و نەمبیستووە ئەم لەشکرە کردبێتی[13].

عومەر خۆیشی شایەتیی بۆ داون. کاتێك شمشێرو جلوبەرگ... ی کیسرایان بۆ هێناو کەزۆر گرانبەهابوون وتی ئەوانەی ئەمەیان تەسلیم کرد دەستپاکن. عەلیش پێی وت: تۆ دەست پاك بووی لەبەرئەوەش ڕەعیەت دەست پاك بوو[14].

لەکاتی فتووحاتی شام و شەڕ دژی بیزەنتییەکان ئەمان هێزێکی گەورەیان هێنا. ئەبوعوبەیدە زانی دەرەقەتی ئەو لەشکرە نادەن بۆیە نامەی نارد بۆ هەموو ئەو والییانەی لە شارەکاندا داینابوون کە ئەو جزیەو خەراجەی لەخەڵکەکە وەرگیرابوون بگەڕێننەوە بۆیان و پێیان بڵێن کە موسڵمانان ناتوانن دیفاعیان لێبکەن. خەڵکی ئەو شارانەش (کە نەصرانی بوون) بەموسڵمانانیان وت: خودا جارێکیتر بتانگەڕێنێتەوەو سەرتان بخات چونکە ئەگەر ڕۆمەکان لەجیاتی ئێوە بوونایە هیچیان بۆ نەدەگەڕاندینەوەو چیمان بۆ دمایەوە دەیانبردو هیچیان بۆ نەدەهێشتین. پاشان کەموسڵمانەکان سەرکەوتن و گەڕانەوە شارەکان خەڵکەکە دەهاتن ئەو جزیەو خەراجەیان دەهێنایەوە کەموسڵمانەکان بۆیان گەڕاندنەوە، ئەبوعوبەیدەش هەمان مەرجە کۆنەکانی دەهێشتەوە. تەنانەت ئەو شارانەش کە پێشتر لەگەڵ موسڵمانەکاندا پەیمانیان نەبووو ئەمجارە پاش شکستی ڕۆمەکان داوای صوڵحیان کرد ئەبوعوبەیدە هەمان مەرجی ئەو شارانەی لەسەر دانان کە زووتر صوڵحیان لەسەر کردبوو، لەوەش زیاتر ئەو شارانەی تازە داوای صوڵحیان کردبوو مەرجی ئەوەیان هەبوو موسڵمانان ڕێگە بدەن بەو ڕۆمانەی بۆ شەڕ هاتبوون و کە لەو شارانەدا مابوونەوە بەکەلوپەل و پارەو کەسوکاریانەوە بەرەو وڵاتی ڕۆم بگەڕێنەوە، ئەبو عوبەیدەش بەم مەرجە ڕازی بوو[15].

وەکو وتم نموونەکانی تۆڵەسەندن لەشارە یاخیبووەکان زۆر کەم بوون لەکاتی فتووحاتداو بەزۆری شارەکە دەگەڕایەوە ژێر هەمان مەرجە کۆنەکان، لەکاتێکدا شارە یاخیبووەکان لەسەردەمی هەموو دەوڵەتانی تردا دووچاری سزای سەخت دەبوون. جگە لەمەش غەدریان لەکەس نەدەکرد. ئەمەش بەکورتی بەسەرهاتی (ئەبوعوبەید کوڕی مەسعوود)ـە لەگەڵ جابان (گابان)داو دواتر بزانین کاك شوان عوسمانی خاوەن ماستەرنامەکە چۆنی باس دەکات:

---

[11] تاریخ الطبری ٤/ ل٢١٠.تەبەری باسی ئەمە لەدەستکەوتەکانی (مەدائین) –پایتەختی ساسانییەکان– دەکات ئەمەش دوای شەڕی قادسییە بوو، تەبەری دەڵێت: (أهل القادسیة) بۆیەش ئێمە بە (لەشکری قادسیە)مان داناو دیارە مەبەست نەك تەنها لەشەڕی قادسییە بەتەنیا بەڵکو مەبەستی ئەمیان و شەڕەکانی دواتریش هەروا.

تێبینییەك لەبارەی مێژووی تەبەرییەوە: تەبەری ڕووداوەکانی کۆکردۆتەوە بێ گوێدان بە دوورخستنەوەی ڕیوایەتی (ضَعیف)و (مَوضوع–هەڵبەستراو) ، کە شتێکە لە زانستی فەرمووده پەیڕەو دەکرێت و تەبەری بۆخۆی دان بەوەدا دەنێت بۆیە بەکارهێنانی کتێبەکەی بێ تەحقیقێك کە بە پێی بنەماکانی زانستی فەرموودە کرابێت مرۆڤ تووشی هەڵە دەکات. منیش ناچار بووم ڕیوایەتەکانی تەبەری وەکوخۆیان وەربگرم. ماوەیەکیش بوو دوو پسپۆڕ، یەکێکیان عەرەب و ئەوەی تر کورد، خەریکی تەحقیقی کتێبەکە بوون بۆ جیاکردنەوەی (صحیح) لە (ضعیف)و ڕەنگە ئێستا بەرهەمەکەیان بڵاوکرابێتەوە.

[12] فەزڵ و پایەی بەشداربووانی شەڕی (بەدر) لای خودا زۆر گەورەیەو بۆتە نموونە.

[13] مێژووی تەبەری، ج٤، ل٢١٠.

[14] مێژووی تەبەری، ج٤، ل٢١٠.

[15] أبو یوسف، کتاب الخراج، ل١٥.

(تەبەری) لەڕیوایەتێکدا دەگێڕێتەوە کە ڕوستەم، سەرکردەی سوپای ساسانییەکان، خەڵکی (سەواد)ی هان دا بۆ ئەوەی دژی موسڵمانەکان بوەستن و وتی سەرۆکی ئێوە ئەو کەسەیە یەکەمین کەس بێت ڕاپەڕێت، جابانیش یەکەم کەس بووو دوای ئەو کەسانیتر ئەمەیان کرد.

موسڵمانانو لەشکری جابان لە (النمارق)دا پێکا چوون، موسڵمانان سەرکەوتنو جابان بەدیل گیرا. ئەو دوو کەسەی گرتیان بینیان پیاوێکی پیرەو نەیانناسییەوە هەرچەندە خشڵی پێوە بوو. دوانەکە ڕێککەوتن چیی پێیە بۆ یەکێکیان و جابان خۆی بۆئەوەی تریان بێتو شتێك لەبرییەوە وەربگرێت. جابان بەمی وت: ئێوەی عەرەب ئەهلی وەفان لەبەرئەوە چی دەڵێیت دوو کوڕی کۆستەی سووکەڵە لەئیشوکارو وا وان بدەمە تۆ بەمەرجێك ئەمینم بکەی. کابرا (مطر کوڕی فضة) ڕازی بوو جابانیش پێی وت: بمبەرە لای پادشاکەتان تا ئەویش ئاگادار بێت ئەویش بردیە لای ئەبو عوبەیدو ئەم ڕێکەوتنە جێبەجێکرا. دواتر خەڵکەکە ناسیینەوەو وتیان ئەمە جابانی پادشایەو لەشکرەکە لەژێر سەرکردایەتیی ئەو بوو. ئەبوعوبەیدیش وتی: ئەی عەشیرەتی (ڕەبیعە) چاوەڕێی چی دەکەن؟ پیاوەکەتان ئەمانی پێ دەداتو منیش بیکوژم؟ پەنا بەخودا دەگرم شتی وا بکەم[١٦].

لەڕوایەتێکی تریشدا ئەبوعوبەید دەڵێت: من لەخودا دەترسم بیکوژم لەکاتێکدا موسڵمانێك ئەمینی کرد، موسڵمانان لەیەکتر خۆشویستن و پشتیوانی یەکتردا وەکو یەك لەش وان، ئەوەشی ئەرکە لەسەر هەندێکیان ئەرکە لەسەر هەموویان، ئەوانیش پێیان وت: ئەمە پادشایەکە، ئەبوعوبەیدیش وتی: با پادشاکە بێت، من غەدری لێناکەم، ئینجا وازی لێهێنا[١٧].

ئینجا بزانن کاکە شوان چی دەڵێت.. ئەمە قسەی شوانە:

ئەم پرۆسەیە سەری گرت (واتە: کارەکەی ڕوستەم)و بەر لەهەموویان دەهقانی ناوچەی (بادکلی – بادگلی) ڕاپەڕینی ئەنجام داو ئەو دەهقانە ناوی (جابان، گابان) بوو لەدژی لەشکری عەرەبە موسڵمانەکان. ئەم فەرەماندەیە چەندین شەڕی خوێناوی گەورەی لەدژی عەرەبە موسڵمانەکان ئەنجام داو تەنانەت لەیەکێ لەشەڕەکان دا بەدیل گیرا، بەڵام بەهۆی زیرەکیو لێهاتوویی خۆی توانی ڕزگاری بێتو دووبارە جاڕی شەڕی عەرەبە موسڵمانەکانی دایەوە (ل١٤٧).

ئێتر دەبێت خوێنەری کورد چۆن وێنەیەك لەبارەی ڕووادوەکانەوە دەستکەوێت ئەگەر ئەمە نووسەرەکانی بن؟ شوان شتی تر لەم جۆرە دەکات وەکو باسی ئەوانەی باوەڕیان بە ئاینەکە هێنابووو ببوونە سەربازی دڵسۆزی وەك (الحمراء) –کە دواتر بەسەرهاتی ئەمان باس دەکەم – و(سیاه)و کۆمەڵەکەی کە ئەمە باسەکەیانە لە کتێبە مێژوویيە ئیسلامییەکانداو دواتر لای شوان.

سیاه لەگەڵ حەفتا لە گەورە پیاوانی فارسدا بوو (ئیبنو کەثیر دەڵێت: گەورەی سێ سەد لەو پیاوە گەورانە بوو کە هاوڕێی نزیکی یەزدیگورد بوون). پاش ژمارەیەك شکست سیاه بە هاوڕێکانی دەڵێت: ئەوە دەزانن کە ئێمە دەمانوت ئەو قەومە داماو و کەساسە ئەم وڵاتە دەگرن (..) ئەوەشیان گرت کە دەیبینن. لەشکریش نییە نەیبەزێنن و قەڵا نییە نەیگرن (لای ئیبنوکەثیر:سیاه دەڵێت بەخوا ئەمە بەرهەمی ناهەق نییە) لەبەر ئەوە بڕیارێك بۆ خۆتان بدەن. هاوڕێکانیشی دەڵێن: قسەی تۆ قسەی ئێمەیە (..) ئەمانەش بوونە موسڵمانو لە گەمارۆی توستەر لە لەشکری موسڵماناندا بوون. یەکێکیش لەو گورزانەی وەشاندیان کاتی گەمارۆدانی قەڵایەك بوو. یەکێك لەوان(ئیبنولئەثیر دەڵێت سیاه خۆی بوو) جلی خۆی خوێناویی کردو خۆی فڕێدایە لای دەرگای قەڵاکە، ئەوانیش وا دەزانن لە خۆیانە بۆیە دەیبەنە ناوە. ئەو پەلاماریان دەدات ئەوانیش هەڵدێن ، ئەویش قەڵاکە دەگرێت. سیاهو کۆمەڵەکەی وا لای ئیبنولئەثیر باسکراون کەچی شوان (ل١٧٧ پ) دەڵێت: ابن الاثیر دەڵێت سیاه برای هورمزیان بووەو دوژمنی سەرسەختی عەرەبە موسڵمانەکان بوو[١٨] !! جگەلەوەی

---

[١٦] مێژووی تەبەری، ج٤، ل٩١.

[١٧] سەرچاوەی سەرەوە.

[١٨] شوان دەنووسێت: الكامل في التاريخ، ج٢، ل١٦٦(چاپی لای خۆم: ل٣٨٧)

ئیبنولئەثیر بەو شێوەیەی سەرەوە باسی سیاه دەکات ئەو ناوی شەهرەیار دەهێنێت کە برای هورموزانەو ناڵێت سیاه برای بووە[١٩]!

* * * * * *

نامەکەی شوانو هەموو کارە هاوچەشنەکان دیفاعن لە ستەمکارییەکانی هەردوو دەوڵەتی ساسانیو بیزەنتی بەڵام بە ئاوازێکی کوردایەتیو بەم جۆرە گۆرانییەکی نەشازو ئاوازێکی ناسازمان بۆ دەڵێن.

هەر میللەتێکیش لەو شەڕانەدا بەشداربووبێت دەورەکەی بریتی بووە لەبەرگری کردن لەدەوڵەتی ساسانیو بیزەنتی.ئەوەش ڕاستییەکی زانراوە کە نەصرانییەکانی ڕۆژهەڵات زۆر لەگەڵ بیزەنتییەکان ناکۆك بوونو لەبەر جیاوازیی مەزهەب دەچەوسێنرانەوەو تەنانەت خۆشحاڵ بوون بەهاتنی موسڵمان تا لەدەستی بیزەنتییەکان ڕزگاریان بکەن بۆیە دەبینین یاخیبوونی شارەکان لەو ناوچەیەدا کەمترە.دواتریش شایەتیی ڕۆژهەڵاتناسان دەخەینەڕوو.

سەبارەت بە دەوڵەتی ساسانیشو ئەو چەوساندنەوەیەی گەلانی ئێرانو غەیری ئێران بەدەستیەوە دەیانچەشت،ئیسلام گۆڕانکاریەکی باشی بۆ گەلانی ئێران بە فارسەکانەوە هێنا. سەرەتا ئەو ڕێسا کۆمەلایەتییانە هەبوون کە کۆمەڵگەیان بۆ چەند چینێکی بەرزو نزم دابەش کردبوو. رۆژهەڵاتناسێکی وەکو(کریستنسن) خەفەتی بۆ ئەوە خواردووە کە چینی باڵا بەرەبەرە لەناو چینەکانی تری گەلدا فەوتاو ئەو تایبەتمەندییانەی ئەشرافی جیادەکردەوە ونکرانو ئەو ((دیموکراسی)) یەی ئیسلام دووچاری گەلی ئێرانی کرد یەکێك بوو لە هۆکارەکانی دابەزینی ئەو گەلە[٢٠].

ئاینەکەش بۆ خۆی لە قەیراندا بوو چونکە وەك ناوبراو دەڵێت پیاوانی ئاین لە دابەزیندا بوونو ئەمە رووی کردە ئەخلاقو عەقیدەو پەرستنیش هەرچەندە ئەمان هەوڵی تازەکردنەوەی ئاینەکەیان دابوو[٢١].

مێژوونووسان باسی ئەو وەزعەیان کردووە کەچی شوان دەیکاتە ((بۆچوون)). شوان دەنووسێت: ((بۆچوونێك هەیە باس لەوە دەکات خەڵك ئەوەندە بێزار بوون لە دەسەڵاتی ساسانی، بۆ زێتر زانیاری بڕوانە حسن محمود کریم، کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا))(شوان، ل١٥٧پەراوێزی١). بەم شێوەیە شوان ئەو ڕاستییە گەورەیەی لە پەراوێزێکی دوو دێڕیدا باسکردووە، ئینجا کردوویەتی بە ((بۆچوون))، ئاماژەشی بۆ کتێبێکی کورد کردووە تا خوێنەر وا تێبگەیەنێ ئەمە بۆچوونی نووسەرەکەیە. بەڵام شوان بەوە ناوەستێتو لە ناواخندا بە خوێنەر دەڵێت کە خەڵکەکە هاوکاریی لەشکری ساسانییان کردووە دژی فاتحە موسڵمانەکان: ((ئەمەش ئەوە رەت دەکاتەوە کە خەڵك بێزار بووە لە ساسانییەکانو پێشوازی لەشکری عەرەبە موسڵمانەکانیان کردووە))(ل١٥٧).

بێ ئەوەی لەسەر قسەی ((پێشوازی)) بڕۆین کە ئاشکرایە موبالەغەی تێدایە، دەبینین شوان پەیوەندیی دەسەڵاتی ساسانی بە خەڵکەوە بەو چەند دێڕە دەبڕێنێتەوە لەکاتێکدا دەبوایە بەشێکی تایبەتیی بۆ تەرخان بکردایە، بەڵام چۆن دەتوانێت ئەوە بکات بێ ئەوەی ماستەرنامەکەی خۆی هەڵنەوەشێنێتەوە؟ لەوە نازانستیترو دوورتر لە ئەمانەتەوە ئەو ڕووداوەی کردوویەتی بە بەڵگە بۆ ((هاوکاریکردنی ساسانییەکان لەلایەن خەڵکەوە)). شوان دەنووسێت: ((پێویستە ئەوە بزانین خەڵکی شاری حولوان هاوکاری تەواوی لەشکری ساسانیان کرد))، ل١٥٦، بۆ ئەمەش ناوی کتێبی (الکامل في التاريخ) دەبات (ج٢، ل١٤٥)، لەکاتێکدا ئەو سەرچاوەیە (ل٢٦٣ چاپی لای خۆم) باسی (الحمراء) دەکات کە عەرەب نەبوونو بوونە موسڵمانو شەڕی باشیان کرد لەڕیزی موسڵمانەکاندا، دواییش ئەلقەعقاع (قوباذ) ناوێك، کەیەکێکە لەوانەی کردە بەرپرسی شاری حولوان(بڕوانە بەشی هەڵبژاردەی کتێب، کتێبی ژمارە پەنجا، خاڵی ٣).

---

[١٩] چاپی لای خۆم، ل٣٨٦

[٢٠] کریستنسن، ایران في عهد الساسانيين، ل١٩٣-١٩٤. مەبەستی ئەویش لە دیموکراسی واتە فراوانەکەیە ئەویش کە عەوامی خەڵك دەورێکی گەورە ببینن ، ئەمەش لەبەرامبەری دەسەڵاتو باڵادەستیی چینی ئەشراف.

[٢١] بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ل٤٧٢-٤٧٣.

شوان پاش ئەوە دەڵێت کە لە شەڕەکانی تریشدا جۆرە هاوکارییەك هەبووە لەنێوان لەشکری ساسانی و جەماوەری شارەکان. شوان بەڵگە ناهێنێتەوە (بەڵگەی راست بێت یان هەڵبەستراو) و بەو رستەیە کلیلی حەقیقەتمان پێ دەبەخشێت: ((ئەمەش ئەوە رەت دەکاتەوە کە خەڵك بێزار بووە لە ساسانییەکان)).

بگەڕێینەوە بۆ شایەتییەکەی کریستنسن. دەوڵەتی ساسانی لە کۆتاییەکانیدا لە وەزعێکی خراپدا بوو. لەنێوان کیسرای دووەم ودوایین پادشای ساسانیی ولاتەکە ماوەی چوار ساڵی پشێویو پڕ ئاژاوەی بینی کە تێیدا بەلای کەمەوە دە پادشا حوکمیان کرد. کیسرای دووەم نموونەی چاوچنۆکی بوو. ئەو پادشایە هەموو رێگەیەکی گرتەبەر بۆ کۆکردنەوەی پارە لە رەعیەتەکەیو زۆربەی ئەو سامانەشی لە خەزنەکانی خۆیدا کۆیدەکرنەوەو بۆ ئارەزووەکان خۆی بەکاری دەهێنان. کریستنسن نموونە لەسەر ئەمە دەهێنێتەوە ئەویش کە دوای ساڵی سیانزەمی حوکمیدا هەشت سەد ملیۆن مسقاڵ درهەم (رەنگە بکاتە هەشت سەد ملیۆن درهەم) لە خەزنەکاندا بوونو لە ساڵی سییەمیداو سەرەڕای شەڕوشۆڕو مەسرەفەکانی خەزنەکان ١٦٠٠ ملیۆن مسقاڵ درهەمیان تێدا بوو ئەمەش جگە لە دەستکەوتەکانی شەڕ[٢٢].

بەلاّم وەك کریستنسن دەڵێت ئەم سامانەی ناو خەزنەکان بە تەواوی ئەو زوڵمەی لە خەڵك دەکرا پیشان نادات چونکە پێویستە ئەو پارە هەرە زۆرانەشی بخەینە پاڵ کە پادشا بۆ ئارەزووەکانیو بۆ دەربارەکەی سەرفی دەکردن[٢٣].

ئەم راوڕووتەو ئەو ئاژاوەیەی دوایی وێنەیەکمان بۆ دەکێشن زۆر جیاوازە لەو وێنەی ئەو کەسانە دروستی دەکەن کە حوکمێکی ئامادەیان لەسەر ئیسلامو فتووحات هەیەو خوێنەری داماو وا تێ دەگەیەنن عەرەبەکان بەهەشتی سەر زەوییان لە خەڵکی ئەو ناوچانە تێك دا. بۆیە سەیر نییە تەبەری لەبارەی سەوادەوە بەتایبەت دەڵێت کەس نەما لە ئەهلی سەواد لە رۆژئاوای دیجلەوە تا خاکی عەرەب دڵی بە فەرمانڕەوایی ئیسلام خۆش نەبێت[٢٤].سەبارەت بە دوایین پادشای ساسانیش تەنها لە مەدائینی پایتەختدا سێ هەزار ملیۆن دینار (کە دەکاتە نزیکەی ٣٦ ملیار درهەم) لە خەزنەکانی یەزدیگورددا هەبوون کە بۆی کرا تەنها نزیکەی نیوەی رزگار بکات. ئەمە جگە لە کەلوپەلی زۆر کە نازانرێت بەهایان چەند زۆرە[٢٥].

ئینجا ئەمەی کیسرای دووەمو یەزدیگورد لەگەڵ ڕوانینی خەلیفەی موسڵمانان بۆ هەر تاکێکی سەربازەکانی بەراورد بکە لەمەشەوە مەبەستی کریستنسن لە ((دیموکراسی)) تێ دەگەی بەلاّم بێ ئەوەی پاساو بۆ داخەکەی بهێنیتەوە.

عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) لە نامەیەکیدا بۆ سەرکردەیەکی خۆی " (النُعْمان کوڕی مُقرِّن) پێش شەڕی نەهاوەند دەڵێت: یەك موسڵمان لای من بەنرخترە لەسەد هەزار دینار[٢٦]. تا بۆشی ڕوون نەبووەوە مانەوەی پادشای ساسانی شەڕەکە درێژخایەن دەکات فەرمانی نەدا موسڵمانان بچنە ناو ولاّتی فارسو شوێنەکانیتر.خەمی ژیانی موسڵمانان وای لە عومەر کردبوو فەرمان دەربکات هیچ سەرکردەیەك سەربازەکان نەباتە دەریا تەنانەت یەکێك لە سەرکردەکان بە دزیی عومەرەوە لەکەنداوەوە پەلاماری فارسی دا.

نموونەیەکی تر لەسەر نرخی کەسی موسڵمان لای سەرکردەکەی ڕووداوی شکاتی هەندێك موسڵمان لە(سەعد)ی سەرکردەی سوپایان. ژمارەیەك کەس لەوکاتەدا شکاتیان لێکرد کە ساسانییەکان هێزیان لەهەموو شوێنێکەوە بۆ نەهاوەند هێنابوو موسڵمانانیان تووشی مەترسییەکی گەورە کردبوو. لەم کاتە ناسکەدا ئەمانە شکاتیان کرد، عومەریش پێی وتن بەڵگەی بەدکاریتان ئەوەیە لەم کاتە پڕ مەترسییەدا ئەمە دەکەن بەلاّم ئەم وەزعە رێم لێ ناگرێت لەم شکاتە

---

[٢٢] سەرچاوەی سەرەوە ، ل٤٣٦-٤٣٧.

[٢٣] سەرچاوەی سەرەوە ، ل٤٣٧.

[٢٤] مێژووی تەبەری (١٩٣٩)، ج٣، ل١٣٥. ئەوەی شارەزای مێژووی ئیسلامییە دەزانێت مێژوونووسە موسڵمانەکان شتەکانیان وەکو خۆیان باس کردووە چونکە ئەو سەردەمە سەردەمی لاڤ لێدان نەبووە کە ئێستا رۆژانە دەیانبیستین، بۆیە تەبەری قسە هەڵنابەستێ کاتێك دەڵێت خەڵك بە حوکمی موسڵمانان دڵخۆش بوون چونکە لەهەمان کات لە مێژووەکەیدا باسی شەڕو کوشتاریش دەکات. خەڵکی ئەو سەردەمەی جیهان بە موسڵمانو ناموسڵمانەوە ئەگەر درۆیان بکردایە باسی سەرکەوتنو کوشتنی ژمارەی زۆر لە دوژمنیان هەڵدەبەست.

[٢٥] ابن کثیر، البدایة والنهایة ، مجلد ٤، ج٧، ل٦٦.

[٢٦] سەرچاوەی سەرەوە، ل١٠٨.

بکوڵمەوە. دواتریش کە دەرکەوت شتەکە ڕاست نییە سەعد ویستی تۆڵەیان لێ بسێنێتەوە بەڵام ئەمەی نەکرد نەوەکو خەڵك لەمەودوا نەوێرن شکات لەئەمیرەکانیان بکەن[27].

نموونەیەکی تریش کاتی گەمارۆدانی شاری (جوندەیسابوور) بوو. موسڵمانان پاش ماوەیەك گەمارۆ لەناکاو دەبینن دەرگاکانی شارەکە کرانەوەو خەڵکەکەی دێنە دەرەوەو کە موسڵمانان لێیان پرسین ئەمان پێیان وتن ئێمەتان ئەمین کرد، موسڵمانان وتیان: هیچ شتێکی وا نەبووە. دوایی زانرا کۆیلەیەکی ناو لەشکری ئیسلامیدا لەخۆیەوە ئەمانەکەی بۆ ناردبوون خەڵکی شارەکەش بەموسڵمانەکانیان وت: ئێمە نازانین کێتان کۆیلەیەو کێتان ئازادە، ئێمە جزیەمان قبووڵ کردووەو ئەگەر پێتان خۆشە غەدرمان لێبکەن. مەسەلەکە وا مایەوە تا نامەیان بۆ عومەر نارد ئەویش ئەمانەکەی پەسەند کرد[28]. لەڕیوایەتێکیشدا عومەر لەوەڵامەکەیدا پێی وتن موسڵمانان عەهدو پەیمانیان یەکە، بەم جۆرەش تەنانەت کۆیلەش نرخی هەبووە.

وەنەبێ عومەر بایەخی بە ڕەعیەتە ناموسڵمانەکەی نەدابێت. ئەوەتا کاتێك (حوذەیفە کوڕی ئەلیەمان)و (عوثمان کوڕی حەنیف) مەسحی سەوادی عیراقیان کردو خەراجەکەیان دا بەسەریدا عومەر پێی وتن: ڕەنگە خەراجێکتان داوە بەسەر زەوییەکەدا کە دەرەقەتی نادات؟ ئەوانیش وتیان: نەخێر دەرەقەتی دەدات و هێشتا ئەگەر زیاتریشمان دابنایە هەر دەتوانێ هەڵیبگرێت[29]. کەسێکی وەك شوانیش لیستی خەراجی وڵاتان دەهێنێتەوە (بێگومان بەهەڵەی زۆرەوە) بۆ ئەوەی دوایی بڵێت خێرو داهاتی کوردستان بۆ خەڵکەکەی نەبووە: ((بۆشمان دەردەکەوێت باپیرانمان چەند ماندوو بوون و بەری ڕەنجیشیان چۆن دیمەشق یان بەغدا لێکێشراوەتەوە)) (ل٢٧٧)، بەڵام ئایا مەرجە داهاتی زۆر نیشانەی زوڵم بێت؟ زۆریی داهات ئیحتمالی ئەوەشی هەیە ئەمینیی و بووژانەوەی ئابووری هەبووبێت. (الواقدی) لە عومەر کوڕی عەبدولعەزیزەوە دەگێڕێتەوە کە خەراجی سەواد کاتی عومەر کوڕی خەتتاب سد ملیۆن درهەم بوو بەڵام لەکاتی حەججاجدا بووە چل ملیۆن درهەم (البلاذري، فتوح البلدان، ل٢٧٠). عومەر نموونەی دادپەروەریی بوو بۆیە خەراج لە کاتی ئەودا زیاتر بوو وەك لە کاتی حەججاج کە نموونەی ستەمکاری بووو ئاژاوەو شۆڕش لە سەردەمەکەی ئەودا بەرپابوون.(قُدامة) پاش ئەوەی بڕی خەراجی ناوچەکان دەهێنێتەوە دەڵێت پێویستە هەڵسووڕێنەری وڵات سەرەتا لەخواترس بێت و پاشان لێزان و دادپەروەرو دەستپاك بێت تا کاروبارەکان ڕێك بڕۆن و پارەیەکی وا بێتە بەرهەم کە جێگەی سەرسوڕمان بێت[30].

موسڵمانان شتێکیان پێ بوو بۆ گەلان کە دوو دەوڵەتە گەورەکەی ئەو سەردەمە پێچەوانەکەیان دەکرد. تەبەری دەگێڕێتەوە کە لە یەکێك لە دانوستانەکانی پێش شەڕی قادسیە (ئەلموغیرە کوڕی شوعبە) کە چووە لای روستەم لەلای ئەودا دانیشت ئەوانەی دەوروبەری روستەمیش بە زبری دایانگرتە خوارەوە، موغیرەش بە روستەمی وت ئێمە لەناو خۆماندا وەکو یەك واین و باشتر دەبوو پێتان بوتمایە کە ئێوە هەندێکتان خوداوەندی ئەوانەی ترن لەمەشەوە دەزانم دەسەڵاتتان بەرەو پووکانەوە دەچێت، حوکمیش بەم ڕەفتارانە دانامەزرێت.ئینجا کاتێك چینە نزمەکە[31]، کە لەو شوێنەدا بوون، ئەم قسانەو قسەی تری موغیرەیان بیست وتیان کابرای عەرەب ڕاست دەکات دەهقانەکانیش وتیان کابرا شتێکی وت کۆیلەکانمان بەردەوام شەیدایین[32].

لە وتووێژێکی ترداو بەگوێرەی تەبەری کە لەزاری (الرفیل)– کە دەهقانێکی سەواد بوو– دەیگێڕێتەوە کە چۆن پەیامی فاتحەکان بووە هۆی ئەوەی مەیلی بۆ دروست بێت بۆ ئیسلام ، (زوهرە) ، نوێنەری موسڵمانەکان، شتەکان بە روستەم دەڵێت: شایەتمانیی و نەهێشتنی ئەوەی خەڵك خەڵك بپەرستن بەڵکو تەنها خودا بپەرستن، خەڵکەکەش کوڕانی

[27] ابن كثير، البداية والنهاية ، مجلد٤، ج٧، ل١٠٦.
[28] ابن الأثير، الكامل في التاريخ، ج٢، ل٣٨٧–٣٨٨.
[29] بڕوانە: د. توفيق اليوزبكي، دراسات في النظم..، ط ١، ل١٣٠.
[30] قدامة بن جعفر، الخراج و صناعة الكتابة، ل١٨٤.
[31] وشەکە لێرەداو لە بەسەرهاتەکەی تردا (سِفْلة)یە کە واتای نزمو هەرچی وپەرچی دەدات.
[32] تەبەری (١٩٣٩)، ج٣، ل٣٦.

ئادەم‌و حەووان‌و لە دایك‌و براوە بران. روستەمیش لێی دەپرسێت: ئەگەر من وقەومەکەم بەمە ڕازی بووین ئێوە دەگەڕێنەوە ولاتی خۆتان؟ ئەویش دەڵێت : بەڵی‌و هەرگیز توخنی ولاتەکەتان ناکەوین بۆ بازرگانی یان پێویستییەك نەبێت. روستەم وەلامی دەداتەوە: ڕاستیت پێ وتم، خەڵکی فارس لە کاتی ئەردەشێرەوە ڕێگەیان نەدەدا کەس لە چینە نزمەکە واز لە کارەکەی خۆی بهێنێت‌و دەیانوت ئەگەر وا بکەن سنوور دەبەزێنن‌و دوژمنایەتیی ئەشرافەکانیان دەکەن. زوهرەش پێی دەڵێت: ئێمە باشترین کەسین بۆ خەڵکی بۆیە ناتوانین بەو شێوەیە بین" ئێمە گوێڕایەڵیی خودا دەکەین ئەگەر ئەم جۆرە کەسانە پێمان بڵێن گوێڕایەڵیی بکەین ،کەسێکیش سەرپێچی لە فەرمانەکانی خودا بکات بەلامانەوە گرنگ نییە کێیەو کێ نییە(..) پاشان (الرفیل) دەڵێت کە روستەم رۆشت لامدایە لای زوهرەو لەوەوە موسڵمان بووم[٣٣].

لەبەرەی ڕۆمیشدا خەڵك هەبوون دەبوونە موسڵمان، یەکێك لەوانە بە (جرجە) ناوبراوە (ڕەنگە ناوەکەی جۆرجیۆ بێت). ئەمە یەکێك بوو لە فەرماندە گەورەکانی ڕۆم لە شەڕی یەرمووکدا. ناوبراو لە ڕیزەکە دەچێتە دەرو بانگی خالد کوڕی ئەلوەلید دەکات‌و ژمارەیەك پرسیاری لێ دەکات‌و داوای لێ دەکات بەڕاستی وەلامی بداتەوەو زۆری پرسیارەکانی لەبارەی ئیسلامەوە بوون، پاش بیستنی وەلامەکان داوای لێ دەکات ئیسلامی فێر بکات‌و لەگەڵیدا دەڕوات. فەرماندەکە فریای تەنها دوو ڕکعە نوێژ دەکەوێت‌و لەو ڕۆژەدا لەناو لەشکری موسڵماناندا دەجەنگێت‌و هەر لەو ڕۆژەدا زامدار دەبێت‌و گیان لەدەست دەدات[٣٤].

* * * * * * *

لەبارەی کورد وەکو نەتەوەیەك شتێکی زیاد دەبێت باس لە نەبوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد لە کاتی فتووحاتدا بکرێت چونکە ئەمە شتێکە هەموو کەسێك دەیزانێت. هەروەها بۆ هەموو کەسێك ڕوونە کە کوردی ناو لەشکری دوو دەوڵەتەکە شەڕێکی دەکرد هیچ قازانجێکی سیاسیی لێ نەدەکەوتەوە، بگرە بەشدارکردنی کورد ومیللەتانی تر بە میللەتانی بالادەستیشەوە لە شەڕدا کارێکی زۆرەملێ بووە، شکۆمەندیی کوردیش لەو شەڕانەدا وەکو شکۆمەندیی کوردەکانی ناو سوپای عیراقی یان ئێرانییە لە شەڕی عیراق –ئێران سالانی ١٩٨٠ تا ١٩٨٨ کاتێك کورد بە زۆرە ملێ بۆ بەرەکانی جەنگ دەبران. دیارە ئەوانەی وەکو شوان دیانەوێت وای پیشان بدەن کورد شەڕێکی نەتەوەیی کردووە بێ ئەوەی هەست بە خۆیان بکەن ئەوەیان لە خوێنەری کورد دەوێت بۆ هەرەسی دەوڵەتی فارسیی ساسانیی‌و تێکشکانی دەوڵەتی بیزەنتی بگری. کەسێکیش ئەوەی لێمان دەوێت هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەو کەسەی دەیەوێ بۆ شکانی سوپای عیراق یان ئێران لە بەرەیەکی شەڕی ١٩٨٠–١٩٨٨ بگرین. ئەمەش گاڵتەجاڕییەکە بە مێژووی ئێران‌و بیزەنتە دەکرێت ئەگەر بەشداربوونی کورد لە شەڕی دژ بە فاتحە موسڵمانەکان بە کارێکی کوردایەتی بزانین.

ئەوانەی وەکو شوان شت دەنووسن بەردەوام دەڵێن کوردستان بۆتە قوربانییەکی شەڕی نێوان دەوڵەتانی دەوروبەری‌و دەڵێن کورد لەو ململانێیانە هیچی پێ نەبراوە کەچی کە باس دێتە سەر فتووحات کورد دەکەنە خاوەنی قەزیەی دوو دەوڵەتی ساسانی‌و بیزەنتی. هۆی ئەوەش دیارە : بڕیارێکی ئامادە هەیە بۆ ڕەفزکردنی هەر شتێك بۆنی ئیسلامی لێ بێت هەتا ئەگەر ئەو ڕەفزە دژ بە ڕاستیی مێژوویی بێت.

---

[٣٣] سەرچاوەی سەرەوە، ل٣٢–٣٣ .

[٣٤] بۆ تەواوی باسەکەو ئەو پرسیارانەی لە خالدی کرد بڕوانە: البدايةوالنهاية، بەرگی٤، چ٧، ل١٢–١٣.ئیبنوکەثیر چەند لاپەڕیەك پێشتر ناوی (جرجە)یەك دەبات کە خەڵکی ئەرمینیایەو سەرکردەی ١٢هەزار کەس بوو(ل٥).

## شایەتەکان دەدوێن

وەکو تەواوکەرەوەیەکی باسەکەش چاکترە شایەتیی ژمارەیەك نووسەرو بیرکەرەوەو ڕۆژهەڵاتناس لەسەر فتووحات و لەسەر چاوپۆشینی موسڵمانان[*] بهێنینەوە هەرچەندە ئەوە بە خوێنەر دەڵێم کە ئەگەر شارەزای مێژووی فتووحات لەلایەك و مێژووی شەڕانی دەوڵەتانی تر لەلایەکی تر بێت پێویستی بە شایەتیی ڕۆژئاواییەکان نییە چونکە بۆ خۆی دەگاتە ڕاستییەکان.ئەو شایەتییانەی ڕۆژهەڵاتناسانیش لەڕاستیدا لەو دوو جۆرە زانیارییەوە سەرچاوەیان گرتووە. گرنگیی شایەتیی ئەو کەسانەش لەوەدایە تۆ چاوەڕێ دەکەی ئەمانە بە هۆی خەلفیەتی تایبەتی ڕۆژئاواییانەوە ڕاستیی تەواو نەڵێن یان شتەکان بە پێوانەی شارستانیەتی خۆیان لێکبدەنەوە بەڵام کە دەبینی شایەتیەکی تا ڕادەیەك بە ئینساف دەدەن بیر لەوە ناکەیتەوە ئەمانە سۆزیان بەسەریاندا زاڵ بووبێت. لەبەر ئەوە شایەتیی ئەوانە وەردەگیرێت نەك هی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەی ڕای پێچەوانەیان هەیە.

١- (ڤێلهاوزن) سەرەڕای هەندێ بیروبۆچوونی دان بەوەدا دەنێت موسڵمانان بەرامبەر فارسەکانو لە مەسەلەی ئاییندا توند نەبوونو باسی دەکات ئەو فارسانەی بوونە موسڵمان چۆن دڵسۆزییەکیان بۆ ئیسلام نواند[٣٥].

٢- دۆزی Dozy دەڵێت کە چاوپۆشیی موسڵمانانو ڕەفتارەکەیان لەگەڵ ئەهلی زیممە وای کرد ئەمانە لەدەوری ئیسلامدا کۆببنەوە[٣٦].

٣-مەوسووعەیەکی مێژووییش باس لە جوولەکە دەکات کە لەلایەن فەرمانڕەوا نەصرانییەکان دەچەوسێنرانەوەو لەبەر ئەوە زۆر لەو جوولەکانە پێشوازیی باشیان لە فاتحە عەرەبەکان کرد کە چاوپۆشینێکی گەورەتریان لەگەڵ خۆیاندا هێناو لە ڕۆژهەلاتی نزیكو ئیسپانیاو باکووری ئەفەریقیاو بە تایبەتی لە قاهیرە جالییەکانی جوولەکە گەشەیان سەند. لەژێر حوکمی ئیسلامیشدا جوولەکەو ئایینە موعتەبەرەکانی تریش ئاسایشو پاراستن لە دوژمنەکانیانو ئازادیی پەرستنیان بەخۆوە بینیو بەشێکی گەورەی بڕیاردان لەسەر کاروبارە تایبەتیەکانی خۆیان هاتە دەست[٣٧].

٤- تەنانەت ئەوانەش کە نایانەوێت بەتەواوەتی دان بە چاوپۆشینی فاتحە موسڵمانەکان بنێن ناچارن ئەوە بڵێن کە فاتحەکان سەرەتا گوێیان نەدەدایە ئەوەی وڵاتەکان بکەنە موسڵمان. یەکێك لەمانە دەڵێت کە بەموسڵمانکردن وا خێرا ڕووی دا کە دەبوایە خیلافەت بیوەستانایەو نووسەر ئەمە بۆ هۆکارێکی نەتەوەپەرستی دەگەڕێنێتەوە[٣٨]. بەڵام بێگومان ئەو کەسە نەیتوانیوە بڵێت بەموسڵمانکردنەکە بەزۆرەملێ بووەو نموونەی نەهێناوە لەسەر ڕێگەکرتن لەبەردەم موسڵمانبوونی خەڵك (وەرگرتنی جزیەش لەو کەسانەی تازە موسڵمان ببوون لەلایەن هەندێ خەلیفەی ئومەوییەوە تەنها لەبەر هۆکاری دارایی بوو نەك نەتەوەییو هەوڵێکی ئەنقەست نەبوو بۆ دوورخستنەوەیان لە ئیسلام). نووسەرەکە دان

---

[*] وشەی چاوپۆشینم بۆ (تسامح) Toleration بەکارهێناوە.کێشەی چاوپۆشین بەشێکی گەورەی مێژووو شارستانیی ڕۆژئاوای داگیرکردووەو ڕۆژئاوا شانازی بەوە دەکات کە گەشتۆتە پلەیەکی بەرزی چاوپۆشین بەڵام ئەمە پاش کارەسات و خوێنڕشتنێکی زۆر جگە لەوەی تا ئەمڕۆ زوو زوو نموونەی پێچەوانەی چاوپۆشین دەبینین. ئەمە لە کاتێکدا موسڵمانان هەر لەڕێوە چاوپۆشینیان پیادە کردووە وەك دواتر دەیبینین.

٣٥ ولهاوزن، سقوط الدولة العربية، ل٣٩١.

[٣٦] بڕوانە " د. توفيق اليوزبكي، دراسات في النظم العربية الاسلامية، ط١، ل١٨٧.

[٣٧] Kingfisher History Encyclopedia, p.179.

مەوسووعەکە دەڵێت :بەڵام دەبوایە باجی قورستریان لەچاو موسڵمانان بدایەو بۆیان نەبوو خزمەتی سەربازی بکەن(هەمان لاپەڕە). سەبارەت بە باج بڕوانە کتێبەکانی تر کە باسی باجی کەم دەکەن، سەبارەت بە خزمەتی سەربازیش ئەوە ستەم نەبوو بەڵکو نیعمەتێك بوو بۆ گەلان کە تاکەکانیان بەزۆرە ملێ بۆ سەربازی نەبرێن (نووسەری بابەتەکە تەعبیرێك بەکاردەهێنێت کە هەروەها واتای چەکهەڵگرتنیش دەدات).

[٣٨] G. Mourgue, Aux Source de Proche-Orient, p.246.

بەوەشدا دەنێت کە ئەم بەرەوپێشچوونەی موسڵمانبوون بەوە تەفسیر دەکرێت کە کۆمەڵی ئاینی فیکرەی نەتەویی دوورخستەوە[٣٩].

٥ – (فیشەر) لە کتێبەکەیدا لەبارەی ئەوروپای سەدە ناوەڕاستەکان باسێك بۆ ئیسلام تەرخان دەکاتو سەرەتا گومان لەوە دەکات کە ئاین یەکەم هۆ بوویێت بۆ ئەنجامدانی فتووحاتو بۆ سەرکەوتنەکانیو ئەمە دەگەڕێنێتەوە بۆ خواستی دەستکەوتی ماددی[٤٠] بەڵام ئەوەندەی پێ ناچێت دان بەوەدا دەنێت کە ئاین هێزێکی زاتیی دایە ئەو جووڵەیەی عەرەب و ئەم ئایینە ژیانو بەردەوامیی بەو جووڵەیە بەخشیو دواتر باسی ئەو گیانە دەکات کە لەناو عەرەبدا بڵاوبووەوەو بەرزتر بوو لە تەنها ئارەزووی جەنگو دەستکەوتو دەڵێت ئەو گیانە نەبوایە ئەمان نەیاندەتوانی خەڵکی شام ومیسرو فارس و بەربەرەکان لە حوکمی خۆیان ڕازی بکەن. دان بەوەشدا دەنێت کە لەهەموو کارەکانیاندا سەرکەوتووبوون ئەویش بەهۆی ئەو چاوپۆشییەی لەگەڵ جوولەکەو نەصرانییەکان پیادەیان کردبوو[٤١].

دوای ئەوش باسی ڕێنماییەکانی ئیسلام دەکات کە وایان لە لەشکرە ئیسلامییەکان کرد تایبەتمەندییەکی باڵاتریان هەبێت لەچاو هەموو لەشکرەکانی تر بەدرێژایی مێژوو[٤٢].

٦– فەیلەسووفی ناوداری ئەڵمانی (شپێنگلەر)[٤٣] بە شێوەیەکی تر تەماشای فتووحاتی کردووە. بەپێی بۆچوونەکەی ئەو سەبارەت بە ژیارەکان هەر ژیارێك جیایە لەوەی ترو باسی نەفسی یەکەمی ژیارەکان دەکات. ناوبراو باسی نەفسی مەجووسی دەکات کە نەك تەنها زەردەشتیەتی دەگرتەوە بەڵکو هەروەها یەهوودیەت ونەصرانیەتیش کە ئەمانە هەموو بەپاڵ ژیاری عەرەبی(ئیسلامی) لقن لە ژیاری مەجووسی لەکاتێکدا ژیاری کلاسیکی (یۆنانی – ڕۆمایی) بە ژیاری ئەپۆڵۆنی ناو دەباتو کە ئەمیان بە ڕۆژهەڵات نامۆ بوو.

شپێنگلەر بەم پێیە ڕای وابوو فتووحاتی ئیسلامی فەتح وداگیرکردن نەبوون بەڵکو ڕزگارکردنو گەڕاندنەوەی ئەو شوێنانە بوون:

((ئازادبوونی ئەم ڕەگەزە بەشەرییە مەجووسییە نموونەی لە مێژوودا نییە، سووریا ساڵی ٦٣٤ فەتح کرا، نەخێر بەڵکو ئازاد کرا ، دیمەشق ساڵی ٦٣٧ کەوت وهەروەها تەیسەفوون[٤٤] ، میسریش ساڵی ٦٤١ گەڕێنرایەوەو لەو ساڵەدا عەرەب گەشتنە هیندستان، قرتاجە ساڵی٦٤٧ گەڕایەوەو سەمەرقەند ساڵی ٦٧٦ گەڕێنرایەوە، ئیسپانیاش ساڵی ٧١٠ کەوت ، ساڵی ٧٣٢ ش عەرەب لە دەرگاکانی پاریسیان دا)) (شپێنگلەر ، ج١، ل٣٨٨).

شپێنگلەر ئیسلام بە میراتگری مەزهەبە نەصرانییەکانی یەعقووبی ونەستووریو ڕێچکەکانی جوولەکەو فارسی دەزانێتو دەڵێت ئیسلام (موسڵمانان/ف) کە کەنیسەی ئەیا صۆفیای کردە مزگەوت (دوای فەتحی قەستەنتینیە ١٤٥٣ی زاینی/ ف) ئەوەی کردی تەنها ئەوە بوو کە ئەوەی موڵکی خۆیان بوو گەڕاندیانەوە (ج١، ل٣٨٥)و بەرپەرچی ئەوە دەداتەوە کە بە خەیاڵی هەندێ کەسدا دێت کە فتووحات ((کۆچی گەلان)) لە دورگەی عەرەبەوە بوویێت بەڵکو ئەوانە ئەنجامی ڕامالێنێك بوون ئیماندارە دڵگەرمەکان ئەنجامیان دا، ئەو ڕامالێنەی وەکو هەرەسی بەفر وابوو مەسیحییەکانو جوولەکەو مەزدییەکان (زەردەشتییەکان)ی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتو ئەمانە وەکو موسڵمانی زۆر باوەڕدار چوونە ڕیزەکانی پێشەوە. بەرەبەرەکان(..) بوون ئیسپانیایان فەتح کردو فارسەکان بوون لە عیراقەوە دەرچوونو گەشتنە ڕوباری ئۆکسوس (جەیحوون)، دوژمنی دوێنێ بووە هاوڕێی جەنگ لە ڕیزەکانی پێشەوە (ج٢، ل٤٤٦).

---

[٣٩] Ibid.

[٤٠] هـ. أ. ل. فیشر، تأریخ اوربا في العصور الوسطى، القسم الاول، ل٦١. باس نەکردنی مەجووسیو شوێنکەوتەی ئاینی تر لەبەر ئەوەیە فیشەر لە کتێبەکەیدا کەمتر بایەخیان پێ دەدات.

[٤١] هەمان سەرچاوە، ل٦١–٦٢.

[٤٢] هەمان سەرچاوە، ل٦٣.

٤٣ اسوالد شبنغلر، تدهور الحضارة الغربية، ت. احمد الشيباني، بيروت.

[٤٤] وەرگێڕی عەرەبی بە هەڵە ناوەکەی بە زیزفون نووسیوە. تەیسەفوون پایتەختی ساسانییەکان بوو لەبەری ڕۆژهەڵاتی دیجلە.

لەبارەی چاوپۆشینیشەوە دەڵێت هەرچەندە ئیسلام لە مەیدانی سیاسیدا بەشێوەیەكی سەرسوڕهێنەر چاوپۆشیی پیادە دەكرد بەڵام خێرا مەزهەبەكانی ناوچەی یەهوودیەتو مەزدییەت وكەنیسەكانی باشورو ڕۆژهەڵات بە نزیكە تەواوەتی لەناویدا توانەوە(ج٢، ل٣٧٧). بۆ ئەوەی قسەكەی شپێنگلەریش ڕاستتر بێت پێویستە لەجیاتی وشەی (هەرچەندە) وشەی (بەهۆی) دابنێین.

٧- بیریاری ناوداری فەڕەنسی گوستاڤ لوبۆن G.Le Bon لەكتێبەكەیدا(شارستانیەتی عەرەب)[٤٥] باسی فتووحاتو چاوپۆشینی موسڵمانان دەكات.لێرەدا هەندێ لە وتەكانی دەهێنینەوە.

لوبۆن دەڵێت كە هێز فاكتەر نەبووە لە بڵاوبوونەوە قورئان چونكە فاتحەكان لە خەڵك گەڕان لەسەر ئایینی خۆیان بمێننەوە، خۆ ئەگەر هەندێ گەلی نەصرانی بووبێتنە موسڵمان ئەوە بەهۆی ئەوە بووە دادپەروەرییەكیان لەم فاتحانە بینی لە ئاغا كۆنەكانیان نەدیبوو-هەروەها چونكە ئەو ئاسانییەی لە ئیسلام بینیبوویان لە ئایینی تر بەدییان نەكردبوو (لوبۆن، ل١٦٢).

باسی پێغەمبەر یش ρ دەكات كە چاوپۆشییەكی زۆر گەورەی لەگەڵ جوولەكەو نەصرانییەكان پیادە كردبوو و خەلیفەكانی دوای خۆشی لەسەر هەمان ڕەوت ڕۆشتن(ل١٦٢، پەراوێز ١)و هەر لەبارەی چاوپۆشینەوە قسەی چەند مێژوونووسێكی ڕۆژئاوایی نەقڵ دەكات (بڕوانە خوارتر). تەئكیدیش لەسەر ڕاستییەكەی سەرەوە دەكات: ((ئیسلام بە شمشێر بڵاونەبۆتەوە بەڵكو تەنها بە بانگەواز)) (ل١٦٢).

لوبۆن باسی خەلیفە ڕاشیدەكان دەكات كە هەر زوو پەیوەندییان بە خەڵكی ئەسڵیی ناوچەكان كرد كە چەند سەدەیەكی زۆر بوو زوڵمیان لێ دەكراو لەبەر ئەوە ئامادەبوون بە خۆشحاڵییەوە پێشوازی لە هەر فاتحێك بكەن باری قورسی ژیانیان لەسەر سووك بكات. خەلیفەكان زانییان چون زۆرەملێ لەگەڵ كەسدا پیادە نەكەن تا ببێتە موسڵمانو ،بەپێچەوانەی ئیدیعای زۆر كەس (مەبەستی هەندێ مێژوونووسی ڕۆژئاواییی دەمارگیر/ ف.)، زانییان چۆن دووركەونەوە لە كوشتنی ئەو كەسانەی موسڵمان نەدەبوونو لە هەموو شوێنێكدا ڕایانگەیاند كە ڕێز لە بیروباوەڕو نەریتی گەلان دەگرنو تەنها بەوە قایل دەبن جزیەیەكی كەم بەرامبەر پاراستنی ئەو گەلانە وەربگرن ، ئەو جزیەیەیش كەمتر بوو لەو باجانەی بە ئاغا كۆنەكان دەدران (ل١٦٩-١٧٠).

ئینجا باسی ڕەفتاری عومەر دەكات كە چووە قودسو دەڵێت ڕەفتارەكەی ئەو نەرمیو بەزەییە زۆرە دەسەلمێنێت كە فاتحەكان بەرامبەر میللەتە دۆڕاوەكان دەیاننواندو كە ئەمە تەواو پێچەوانەی ڕەفتاری خاچپەرستەكانە كە چەند سەدەیەك دوای ئەوە هاتنە ناو قودس[٤٦]. عومەر ویستی تەنها كەمێك لە هاوەڵانی لەگەڵیدا بچنە ناو قودسو داوای لە پەتریارك صۆفرونیوس كرد هاوڕێتیی بكات كاتی سەردانی شوێنە پیرۆزەكان (ل١٧٠-١٧١) .

پاشان دەڵێت والیی میسر (عەمر كوڕی ئەلعاص) لەو كەمتر نەرمیی نەنواند كاتێك ئازادییەكی ئایینیی تەواوی بە میسرییەكان داو تەنها جزیەیەكی ساڵانەی لەسەر دانان كە لە ١٥ فرەنك (فرەنكی فەرەنسیی كاتی لوبۆن/ف.) تێپەڕی نەدەكرد لە جیاتی باجە قورسەكانی قەیسەرەكانی ڕۆم. بۆیە میسرییەكان بە گوێڕایەڵیو سوپاسەوە ئەو مەرجانەیان قبووڵ كردو میسرییەكان فاتحەكانیان خۆشویست. ئەو میسرییانەش كاتی خۆی تاڵاویان بەدەستی فەرمانبەرانی قەیسرە نەصرانییەكانی قوستەنتینیە دەچەشت بۆیە بە گەرمییەوە ڕوویانكردە دینەكەو ڕوویانكردە فێربوونی زمانی عەرەبی (ل١٧٠).

لەبارەی شارستانیەتیشەوە دەڵێت فتووحات تایبەتمەندییەكی خۆی هەبوو ئەویش ئەوەیە فاتحەكان خێرا شارستانیەتێكیان هێنایە كایە كە زۆر لە شارستانیەتەكانی پێش خۆی جیاواز بوو (ل١٧٠-١٧١).

---

[٤٥] غوستاف لوبون، حضارة العرب ، ت. عادل زعیتر ،ط٢، ١٩٤٨.

[٤٦] بێگومان هەروەها تەواو پێچەوانەی ڕەفتاری جوولەكە كە دواتر فەڵەستینو قودسیان داگیر كردو تا ئێستا لەبەر چاوی هەموو جیهاندا كوشتاری خۆیان دەكەنو خانووی فەڵەستینییەكان دەڕووخێنن، كە ئەمە هەمان كاری بەعس ، كە نیزامێكی عەلمانییە بەناهەق كەلتووری ئیسلامیی بەكاردەهێنا، دەخاتەوە یادمان.

لە سەرووتریشدا باسی واتا فراوانەکەی ((دیموکراسی))مان کرد کە (کریستنسن) بەکاری هێناوە. لوبۆنیش بۆ خۆی ئاماژە بۆ شتێکی وا دەکات کە لە کاتی خەلیفە ڕاشیدەکاندا یەکسانییەکی تەواو هەبووو حوکمی شەریعەت بۆ هەمووان بووو دوو نموونە دەهێنێتەوە یەکێکیان لە کاتی عومەرو ئەوەی تر لەکاتی عەلی. ئەمەش بە نیزامی دیموکراتی ناو دەبات و دەڵێت گۆڕان لە نیزامی دیموکراتییەوە بۆ نیزامی پادشایی تەنها وردەوردە ڕووی داو خەلیفەکان لە دواییدا بوونە پادشای موستەبد بەڵام تا ئێستا (واتە تا کاتی لوبۆن –کۆتایی سەدەی نۆزدە) عەرەب (مەبەستی موسڵمانان) بە یەکسانی لەبەردەم شەریعەت ماونەتەوە (ل١٧٣-١٧٤). بێگومان ئەمە تەواو جیاواز بوو لە نیزامی پادشایی دوو دەوڵەتە گەورەکەی سەردەمی فتووحات و بەتایبەت نیزامی شاهنشاهانەی ساسانییەکان.

٨- وتمان لوبۆن لەبارەی چاوپۆشینەوە شایەتیی چەند مێژوونووسێکی ڕۆژئاوایی (کە بە خاوەن ئینساف وەسفیان دەکات) نەقڵ دەکات :

<u>ڕۆبرتسۆن لە کتێبی (مێژووی شارلکان):</u> تەنها موسڵمانەکان بوون کە هەردوو شتەکەیان پێکەوە کۆکردبووەوە: غیرەت بۆ ئایین و چاوپۆشی لەگەڵ شوێنکەوتووانی ئایینەکانی تر. هەرچەندیشە شمشێریان بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینەکەیان هەڵگرت بەڵام ئازادیی ئەوەیان دا بەو کەسانەی نەیاندەویست ببنە موسڵمان لەسەر دینی خۆیان بمێننەوە.

<u>میشۆد لە کتێبی (مێژووی شەڕانی خاچپەرست):</u> ئەو ئیسلامەی فەرمانی بە جیهاد داوە چاوپۆشی لەگەڵ ئایینەکانی تر پیادە دەکات.

<u>(میشۆ)ی ڕاهب لە کتێبی (گەشتێکی ئایینی لە ڕۆژهەڵاتدا):</u> جێگەی داخە کەوا گەلە نەصرانییەکان لە موسڵمانانەوە چاوپۆشی کە نیشانەی چاکەکارییە نێوان میللەتان و ڕێزگرتن لە بیروباوەڕی کەسانی ترو بەزۆر فەرزنەکردنی بیروباوەڕ بخوازن (ئەم سێ شایەتییە لە لاپەڕە ١٦٢، پەراوێز).

٩- گی دو بوشێر لە کتێبی (نەشتەرگەریی کردنی کەلاکی ئیستعمار) دەگاتە سەر دیاردەی فراوانیی ئیسلامی و بەپێی ئەو پێوانەیەی بۆ ئیستعماری داناوە دەڵێت ئیسلام نە لەڕووی بناغەوەو نە لەڕووی بونیادەوە ئیستعمار نەبووە. یەکەمیان لەبەر ئەوەی فراوانکاریی ئیسلامی نەیدەویست گەلان ملکەچ بکات و سەرچاوەکانی سامان لە وڵاتە گیراوەکاندا تەنها بۆ فاتحەکان بەکاربهێنێت، بەڵکو دەیویست ئەو گەلانە، پاش ئەوەی بەشێوەیەکی کاتی بیانهێنێتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، بێنە سەرئەو ئایینە نوێیە. خەڵکی شام پاش موسڵمانبوونیان لە فتووحاتدا بەشدار دەکران و بەم جۆرە ئەوانیش دەبوونە فاتح، ئەمەش بوو ئەو کارەی موستەعمری ئەورووپی هەرگیز نەیدەکرد(..). فەتحی ئیسلامی دوو ئامانجی هەبوو ئەویش کە لەیەك کاتدا هەردوو مافی هێزو هێزی ماف زاڵ بن، بەڵام موستەعمری ئەورووپی تەنها مافی هێزی دەهێشتەوە.فاتحی ئیسلامی ژیانێکی نوێی ، بەواتای تەواوی وشەکە، دەخستە بەردەم خەڵکی وڵاتە گیراوەکان و کە لەم ژیانەدا هاوشانی دەبن و لەگەڵیدا یەکسان بن ، لەکاتێکدا موستەعمری مەسیحی کە خەڵکی موستەعمەراتی دەهێنایە ناو ئایینەکەی خۆیەوە یەکسانییەکی شکلیی پێ دەبەخشین کە لە باشترین حاڵەتدا لە ئاستی ڕوحیدا بوو، لە ئاستی دنیاییشدا ئەورووپا هەموو مافەکانی هەبووو هەر خۆی حەکومڕانیی دەکرد. ئەمە لەڕووی بناغەوە، لەڕووی بونیادیشەوە ئیمپراتۆرییەتی ئیسلامی کە بەرهەمی فەتح بوو تایبەمەندییەکانی ئیستعماری نەبوو چونکە ئەوەندە بەس بوو گەلەکە ببوایە موسڵمان ئیتر بۆی هەبوو بەشداری لە فەتح و بەرهەمەکانی سەرکەوتن و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی وڵات بکات (دو بوشێر ، ل١١٨-١١٩) .

١٠- تۆماس ئارنۆڵد لە کتێبی (بانگەواز بۆ ئیسلام)[٤٧] زۆر لەم بارەیەوە دەڵێت چونکە کتێبەکە بۆ باسی چالاکیی بانگەوازو بڵاوکردنەوەی ئیسلام تەرخان کراوە. ئارنۆڵد پاش ئەوەی چەند نموونەیەك لەسەر چاوپۆشی لەگەڵ نەصرانییەکان دەهێنێتەوە دەڵێت: لەم نموونانەی چاوپۆشی کە فاتحە سەرکەوتووەکان لەگەڵ عەرەبە نەصرانییەکان لە

[٤٧] ت. و. ارنولد، الدعوة الى الاسلام، بحث في تاريخ نشر الدعوة الاسلامية، ت. حسن ابراهيم حسن و عبدالمجيد عابدين و اسماعيل النحراوي، القاهرة، ١٩٤٧.

سەدەی یەکەمی کۆچیدا کردیان‌و لە نەوەکانی دواتر بەردەوام بوو دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەم هۆزە مەسیحییانەی بوونە موسوڵمان بە هەڵبژاردن‌و ئازادیی خۆیان ئەمەیان کردووە (ل٥١).

لەبارەی جزیەشەوە دەڵێت: مەبەست لەو باجەی خرایە سەر نەصرانییەکان ئەوە نەبووە سزای نەصرانییەکان بدرێت لەبەر ئەوەی نەبوونە موسڵمان ، وەك چۆن هەندێ لێکۆڵەرەوە دەیانەوێ ئەو باوەڕە بکەین ، بەڵکو نەصرانییەکان لەگەڵ باقی ئەهلی زیممە ئەو جزیەیان بەرامبەر بەوە دەدا کە بپارێزرێن. ئارنۆڵد نموونە لەسەر ئەوە دەهێنێتەوە وەك پەیمانی خالید کوڕی ئەلوەلید لەگەڵ هەندێ خەڵکی شارەکانی دەوروبەری (حیرە) کە تیایدا هاتووە: ئەگەر ئێوەمان پاراست جزیەتان لێ وەردەگرین ئەگینا وەریناگرین. هەروەها بەسەرهاتی ئەبو عوبەیدە لەگەڵ خەڵکی شارەکانی شام دەگێڕێتەوەو کە پێشتر باسم کردبوو. پاشان دەڵێت دیارە کە هەر کۆمەڵێکی نەصرانی خزمەتی سەربازیی بکردایە لە جزیەدان دەبەخشرا هەروەکو هۆزی (ئەلجەراجیمە) لە نزیك (ئەنتاکیە) کە پەیمانی دا شەڕ لە پاڵ موسڵماناندا بکات بەو مەرجەی جزیەی لەسەر لاببرێت‌و لە دەستکەوتەکانی شەڕ بەشی بدرێت. پەیمانی واش لەگەڵ هۆزێکی باکووری فارس کرا (ل٥٨-٥٩). نووسەر پاشان نموونەی تر لە سەردەمی عوسمانی دەهێنێتەوە (ل٥٩).

(لە خوارەوەدا هەندێ لە نموونەکان هی سەردەمەکانی پاش فتووحاتن بەڵام ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی چاوپۆشیی موسڵمانان‌و پێکەوە ژیان لەگەڵ شوێنەکەوتووانی ئایینەکانی تر بووە تەقلیدێك کە ئەساسەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بنەماکانی ئیسلام‌و بۆ ڕۆژانی دەسەڵاتی ئیسلامی. فەقیهەکانیش زۆر جار دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کارانەی لەو سەردەمەدا کرابوون).

دەسەڵاتی ئیسلامی چاوپۆشیی لەگەڵ هەموو تایفە نەصرانییەکاندا دەکردو جگە لەوە نەیدەهێشت هیچیان تەعدا لەوەی تر بکات, ئارنۆڵد پاش ئەوەی دوو نموونە لەسەر پیلانی تایفەکان دژی یەکتر دەهێنێتەوە ... کە لە یەکێکیاندا بە پلانی ئەسقوفێکی نەستووری‌و وەك باسکراوە ٧٨٠٠ لە پیاوانی کەنیسەی ئەرتۆدۆکسی‌و ژمارەیەکی زۆری خەڵکی تر لەسەر دەستی فارسەکان کوژران ... دەڵێت موسڵمانان ڕێگەیان بەم شتانە نەدەداو دیارە کە دادپەروەرانە مامەڵەیان لەگەڵ هەموو ڕەعیەتە نەصرانییەکانیان دەکرد. بۆ نموونە پاش فەتحی میسر یەعقووبییەکان دەیانزانی دەسەڵاتی بیزەنتی نەما بۆیە کەنیسەکانیان لە ئەرتۆدۆکسەکان زەوت کرد بەڵام پاش ئەوەی ئەمانە بەڵگەیان بۆ دەسەڵاتی ئیسلامی هێنایەوە کە ئەو کەنیسانە هی خۆیانن ئەم دەسەڵاتە کەنیسەکانیان بۆ گەڕاندنەوە (ل٦٥) (بڕوانە کە ئەرتۆدۆکسەکان لەسەر هەمان مەزهەبی بیزەنتییەکان بوون‌و کە ئەمان لە شەڕدابوون لەگەڵ موسڵمانەکان/ ف.).

ئارنۆلد تەنانەت دەڵێت کەنیسەی نەستووری لە سایەی ئیسلامدا بووژانەوەیەکی گەورەی بەخۆوە دی‌و تەنانەت بەهۆی ئاسایشی ناو وڵاتەکەیان کە لە کاتی خەلیفەکاندا بەخۆیەوە بینیبووی توانییان (بعثة) بۆ چین‌و هندستان بۆ بانگەواز بۆ دینەکەیان بنێرن (ل٦٤).

ئینجا ئارنۆڵد دەڵێت ئەگەر تەماشای ئەم چاوپۆشییە بکەین کە لەسەردەمی یەکەمی ئیسلامدا لەگەڵ ڕەعیەتە نەصرانییەکان کرابوو بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو فیکرەیەی بڵاوبۆتەوە سەبارەت بەوەی شمشێر هۆکار بوو بۆ کردنی خەڵك بە موسوڵمان فیکرەیەکە زەحمەتە بڕوای پێ بکرێت (ل٦٥).

موسڵمانبوونی کۆمەڵانێکی زۆر لە نەصرانییەکانی خوڕاسان بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی نەصرانییەکان بەبێ زۆرەملێ بوونە موسڵمان. ئارنۆڵد بۆ ئەمە دەقی تەواوی نامەی قەشەیەکی نەستووری بۆ سەرۆکی ئەسقوفەکانی فارسی هێناوە. مەترانەکە ئەسەف بۆ ئەم موسڵمانبوونەی هەزاران نەصرانی دەخوات‌و باسی دەکات کە ئەمە بە زۆرەملێ نەبووە چونکە عەرەب وەك مەترانەکە نووسیویەتی ((دژایەتیی باوەڕی مەسیحی ناکەن بەڵکو بەپێچەوانەوە سۆزیان هەیە بۆ دینەکەمان‌و ڕێز لە قەشەکانمان‌و لە قددیسەکانی خودا دەگرن‌و فەزڵ بە کەنیسەو دێرەکانمان دەبەخشن)). مەترانەکە دەڵێت خەڵکی (مەرو) خۆیان وتوویانە کە زۆریان لێ نەکراوە واز لە ئایینەکەیان بهێنن (ل٧٥-٧٦).

بوونە موسڵمان تەنانەت لەناو ئەو خاچپەرستانەش ڕووی دەدا کە هاتبوونە شام. ئارنۆڵد ژمارەیەك نموونە لەم بارەوە دەخاتە ڕوو. یەکێکیان (ساڵی ١١٤٨ ی زاینی) بەراوردییەکی تێدایە لە نێوان غەدرو خیانەتی بیزەنتییەکان لەو

نەصرانییانەی لە ئەوروپاوە لە هەڵمەتی دووەمدا هاتبوون‌و بەزەیی موسڵمانەکان بە بریندارو نەخۆشەکانی ئەو نەصرانییانە. نەصرانییەکان لە ڕێگەدا لەسەر دەستی تورکەکان دەشکێن‌و پاشەکشە دەکەن‌و نەخۆش‌و زامدار لەدوای خۆیاندا جێدەهێڵن. بیزەنتییەکان کە هاوپەیمانیان بوون پارەیان لێ دەسەنن بۆ پاراستنیان کەچی دواتر شوێنەکەیان بۆ تورکەکان ئاشکرا دەکەن‌و بەهۆی ئەمەوە ژمارەیەکیان لێ دەکوژرێ ، ئەوانەی تریش کە دەستگیرکران ببوونە جێگەی بەزەیی تورکەکان. ئەمان یارمەتی نەخۆش‌و برسی‌و هەژارەکانیان دا، تەنانەت پارەشیان بەسەردا دابەش کردن. ئەم جیاوازییەی مامەڵە لە نێوان موسڵمانەکان کە نەصرانییەکان بە کافریان دەزانین لەگەڵ بیزەنتییە هاودینەکەیان کە سوخرەیان خستبووە سەر شانیان‌و لێیان دەدان‌و کەلوپەلەکانیان لێ سەندبوون جیاوازییەکی زۆر گەورە بوو بۆیە ، وەکو ئەو قەشەیە دەڵێت کە باسی ڕووداوەکەی کردووە، زۆر لەوانە بوونە موسڵمان (ل٨٠).

لەو سەدەیەدا ژمارەیەکی زۆر لە نەصرانییەکان هەڵگەڕابوونەوەو ئارنۆڵد دەڵێت ئەو موسڵمانانە ناناسین کە ئەم کەسانەیان بۆ ئیسلام ڕاکێشابوو بەڵام وەك ناوبراو دەڵێت ئەوە دەزانین کە لە سەرووی هەموویان صەلاحەددینی مەزن هەبوو. نووسەری ژیانەکەشی وای باس کردووە کە جوانیی ئیسلامی خستە بەردەم میوانە نەصرانییەکەی (ل٨٢). ئارنۆڵد دەڵێت دیارە ئەخلاق‌و ژیانی صەلاحەددین کە پاڵەوانێتیی تێدا هەبوو کارێکی سیحریی تایبەتی لەسەر بیری نەصرانییەکانی کاتی خۆی کردبوو, تەنانەت ژمارەیەك سوارچاکی نەصرانی وازیان لە ئاینەکەی خۆیان هێناو چوونە ڕیزی موسڵمانان (ل٨٢-٨٣).نووسەر ژمارەیەك نموونە لەسەر ئەم موسڵمانبوونەی خاچپەرستان دەهێنێتەوە (ل٨٣-٨٤).

شتەکان لەبارەی چاوپۆشی لەگەڵ نەصرانییەکاندا لەو کتێبەدا لەڕادەبەدەر زۆرن بۆیە بەو تێبینییە کۆتایی بەم باسە دەهێنم ئەویش ئەوەیە کە تەنانەت لە سەردەمێکی دوور لە کاتی فتووحات ، مەبەست سەردەمی عوسمانی (پێش قۆناغەکانی داڕووخانی)[٤٨] موسڵمانان نموونەی چاوپۆشی بوون. نەصرانییەکان بە پێی ئارنۆڵد پێیان خۆش بوو بچنە ژێر دەستی عوسمانییە موسڵمانەکان نەك ژێر دەستی ئەو نەصرانییانەی لەسەر مەزهەبی خۆیان نین‌و لەبەر ئەم جیاوازییە دەیانچەوساندنەوە. بۆ نموونە باسی پرۆتستانتی (سیلیزیا) دەکات کە ((بە خۆشحاڵییەوە ئاواتەخواز بوون ئازادیی ئاینی بە ملکەچی بۆ حوکمی ئیسلامی بکرێنەوە )) (ل١٣٨) .

نووسەر لە بەشێکی کتێبەکەیدا باسی فارس دەکات‌و دەڵێت موسڵمانان بەرگرییەکی وایان لە گەلی فارسی نەبینی[٤٩]. نوێنەرەکانی دەوڵەتی ساسانی لە ڕۆژانی دوایەمینی ئەو دەوڵەتەدا کە فەوزاو ستەمکاری زۆری تێدا بوو ئیستبدادیان بەرامبەر بە گەلەکە پیادە دەکرد(ل١٧٩). گەلی فارسی، ناوبراو دەڵێت، ڕقێکی زۆری بۆ دروست ببوو … بە هۆی چەوساندنەوە …. بەرامبەر ئاینی زەردەشتی‌و بەرامبەر بەو دەوڵەتەی ڕەزامەندو هاندەری ئەو چەوساندنەوەیە بوو. سەرکەوتنی موسڵمانانیش بۆ ئەو حاڵەتی ڕق‌و ناڕەزاییە دەگەڕێنێتەوە. فارسەکان لەبەر سێ هۆ پێشوازییان لە موسڵمانەکان کرد: یەك" ڕزگاریان بێت لە زوڵمی فەرمانڕەواکانیان ، دوو" ڕزگاریان بێت لە خزمەتی سەربازی ، سێش" ئاواتەخواز بوون ئازادیی ئایینییان دەستبکەوێت چونکە ئیسلام ڕێگەی بە شوێنکەوتوانی هەموو ئاینێك دەدا لەسەر ئەو ئایینە بن کە حەزیان لێیە بەمەرجی جزیە دان (ل١٧٩) .خەڵکی شارەکان بەتایبەتی کرێکاران‌و پیشەوەران پێشوازیان لە ئیسلام کردو ژمارەیەکی زۆریان بوونە موسڵمان چونکە سروشتی ئیشەکەیان وای دەخواست واز لە دینی زەردەشتی بهێنن‌و پەرستنی ئاگرو زەوی‌و ئاو بە ناشیرین بزانن. ئەمانە لەبەردەم یاسادا بە چاوێکی سووك‌و بە قێزەوە تەماشا

[٤٨] لە کۆتاییەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا فەرمانبەران زۆرتر لەجاران لەبنەماکانی ئیسلام دوورکەوتبوونەوەو خەریکی ڕاوڕووت بوون تا گەشتە کاتی ئیتتحادو تەرەققی کە لە جیاتیی ئەخلاقی ئیسلامی شۆڤێنیەتێکی نەتەوەیی دەیجووڵاندن. جگەلە زوڵمی کاربەدەستان ، ڕۆژئاوا نەصرانییەکانی دەوڵەتی عوسمانییان بەکاردەهێناو ئەمە کاردانەوەیەکی خراپی هەبوو لای کاربەدەستان‌و خەڵکە موسڵمانەکە بەکوردەوە کە یەکێك بوون لە زەرەرمەندەکان.

[٤٩] واتە وەکو جەماوەر بەرگرییەکی وایان نەکرد. ئاشکراشە ئەم جۆرە بەرگرییانە بڕیاری سەرکردەکان بوو.

دەکران (ل١٨٠). ئەنجامی ئەو ڕاستییانەش ئەوەیە هەرگیز ناکرێت بتوانین بڵێین پووکانەوەی زەردەشتیەت بەهۆی ئەوە بووە فاتحەکان هێزیان بۆ بەموسڵمان کردنی خەڵك بەکارهێنابێت (ل١٨٢).

١١- شایەتیی ڕۆژهەڵاتناسێکی تر هەیە کە تەنیا قسەیەکی دەهێنینەوە ئەویش کایتانی Caetani یە. ناوبراو باسی ساڵانی یەکەمی حوکمی ئیسلامی دەکات کە کەس لەبەر ئایین نەچەوسێنراوەتەوە بۆیە نەصرانییە سامییەکان لە سایەی ئیسلامدا پاش فتووحاتی یەکەم ئازادییەکیان بینی کە بە درێژایی چەند نەوەیەکی زۆر نەیاندیبوو (ئارنۆڵد، ل٥١ پ٢).

١٢- وڵ دیورانت لە (چیرۆکی شارستانی)دا دەڵێت: زیمییەکان لەکاتی خیلافەتی ئومەویدا چاوپۆشییەکیان لەگەڵدا دەکرا هاوشێوەی لەم ڕۆژانەدا نابینین(ج١٣، ل١٣٠).

١٣- کتێبی (جۆرج قورم)[٥٠] مان هەیە وەکو شایەتییەکی تر هەرچەندە خاوەنەکەی ڕۆژئاوایی نییە. کتێبەکە دکتۆرانامەیە لە زانکۆی پاریس (ساڵی ١٩٦٩)و بە فەرەنسی ساڵی ١٩٧١ لە پاریسدا بڵاوکراوەتەوەو پاشان کراوە بە عەرەبی. ناوبراو،کە نەصرانییەکی لوبنانییە، باس لە کۆمەڵگەی فرەئایینی دەکاتو بەشێکی بۆ پەیوەندیی ئایینەکان لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا تەرخان کردووە (ل١٧٩-٣٢٨) لەگەڵ ئاماژە بۆ ئیسلام لەشوێنی تری کتێبەکە. ئەمانەی خوارەوەش شتێکی زۆر کەمن لە باسەکانی نووسەر:

لەبارەی گەلانی ڕۆژهەڵاتی کە لەژێر دەستی ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتیدا بوون" نووسەر دەڵێت :ئەمرۆ هەموو مێژوونووسان دان بەوەدا دەنێن کە ئیسلام لە قۆناغێکی یەکەمدا تەنگانەی ڕەواندەوەوو ئاشتیی هێنا بۆ گەلانی ڕۆژهەڵاتی کە ناڕەحەتییان بەدەستی بیزەنتییەکان دەچەشت لە چەوساندنەوەو ستەمکاریو ماندووکردن لەڕووی داراییەوە (ل١٤٦). بەرامبەر بەو فەوزا ئایینییەش کە بەهۆی ناکۆکیو سەرهەڵدانی بیدعەکاری دروستببوو عەقیدەی ئیسلامی هات کە عەقیدەیەکی سادە وئاسان بووو پەرستنی ئاڵۆز نەدەکردو مەرجەکانی باوەڕی قورس نەدەکرد بەجۆرێك ((بوارێکی زۆر فراوان بۆ ئازادیی ویژدانی کردەوە))، لەڕووی داراییشەوە نیزامی باجی دەوڵەتی ئیسلامی زۆر ئاسان بووو ئەرکی سووك بوو (ل١٤٧).

سەرەڕای پێشڕەویی ئیسلام لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی بیزەنتی " دەمارگیریی مەزهەبیی ئەو دەوڵەتە دژ بە تایفە نەصرانییەکانی تر هەر بەردەوام بوو، ئەمەش ڕقێکی گەورەی دروست کرد" بۆ نموونە ئەو ڕقەی لای کەنیسەی ئەرمەنی دروستببوو، بۆیە سەرۆکی سوپای ئەرمەنی ساڵی ٦٥٣ی زایینی دانوستانی لەگەڵ موعاویە ساز داو دەرگای وڵاتەکەی بۆ موسڵمانان کردەوە (ل١٤٨). دواتریش کە ئەرمینیا کەوتەوە دەستی بیزەنتییەکان (٦٨٦-٦٨٧ ی زایینی) - ئەویش بەهۆی ئەو بەزمانەی تووشی دەوڵەتی ئوموی ببوون - دیسان چەوساندنەوەیان دژی پیاوانی ئایینیی ئەرمەن پیادەکردەوە بۆیە موسڵمانان توانییان بیّ هیچ بەرگرییەك وڵاتەکە بگرنەوە (ل١٤٨). ئەم دەمارگیرییە دیسان لە سەدەی یانزەمی زایینیدا دووبارە بووەوە (ل١٤٨-١٤٩).

فەتحی ئیسلامی فەرەحییەکی هێنا بۆ ئەوانەی لە کەنیسەی بیزەنتی دەرچووبوون پاش ئەو تەنگانەیەی تێیدا دەژیان بۆیە زۆربەیان پێشوازییان لە فاتحەکان کردو هیچ بەرگرییەکیان نەکرد، ئەمەش ڕاستییەکە هەموو مێژوونووسانو نووسەرە نەصرانییەکانی هەواڵەکانو ساڵنامەکان شایەتیی لەسەر دەدەن (ل٢٣٢).

لەسەردەمی ئیسلامیدا هەردوو کەنیسەی یەعقووبیو نەستووری بەتایبەت گەشەیەکی وایان سەند کە پێشتر بە خۆیانەوە نەیاندیبوو (ل٢٣٢). لێرەدا (قورم) شایەتیی پەتریارکی ئەنتاکیە (١١٦٦-١١٩٩ ی زایینی) دەهێنێتەوە کە باسی کاتی فتووحات دەکاتو دەڵێت کەوا خوداوەندی تۆڵە کاتێك بەدکارییەکانی ڕۆمی بینی لە تاڵانکردنی کەنیسەو دێرەکانو سزادانی بیّ بەزییانە کوڕانی ئیسماعیلی هێنا بۆ ئەوەی ڕزگاریمان لەسەر دەستی ئەواندا بێت (ل٢٣٢ ، ئارنۆڵدیش درێژتر لە کتێبەکەیدا دەیهێنێتەوە ، ل٥٣).

---

[٥٠] جورج قرم ، تعدد الادیان و انظمة الحکم، دراسة سوسیولوجیة وقانونیة مقارنة، بیروت، ١٩٧٩.

نووسەر شایەتیی ڕۆژهەڵاتناسی تر دەنووسێت وەك دی گۆیە De Goeje (دەنووسێت: دی غوج) لەبارەی هەڵوێستی نەصرانییەکانی سووریا لە فەتحی ئیسلامی دەهێنێتەوە کە ئەمانە وەکو تەماشاکەر سەیری ئەو هێزانەیان دەکرد کە دەچوونە ناو وڵاتەکەیان بەڵکو تەنانەت لایەنگیریی خۆیان بۆ عەرەب نەدەشاردەوە پاش ئەوەی ئەمانە بەڵگەی تەواو سەلماندیان نیازیان نییە وڵاتەکە تالان بکەن یان خراپەکاریی تێدا ئەنجام بدەن و بە نەرمی ڕەفتار لەگەڵ هەر کەسێك دەکەن کە گوێڕایەڵ بێت (ل٢٣٣، پەراوێزی ١٠٠).

نووسەر هەروەها قسەکەی گۆبینۆ Gobineau نەقڵ دەکات:((ئایین نییە لە مەسەلەی چاوپۆشیدا شان لە شانی ئیسلام بدات))(ل٢٣٨).جگەلەمانەش کتێبەکە شایەتیی تری تێدایە.

نووسەر باسی ناکۆکیی نێوان تایفە نەصرانییەکان لەکاتی دەوڵەتی عوسمانی دەکات کە چۆن هەندێکیان بە هاندانی دەوڵەتە گەورەکان کێشەیان بۆ دەوڵەتەکە دروست دەکردو بەهانەیان دەدایە ئەو دەوڵەتە گەورانە دەست بخەنە ناو کاروباری عوسمانییەکان (ل٢٨٠-٢٨٢). هەروەها مژدەدەرەکان بە خراپی ئەو ئازادییە ئایینییەیان بەکاردەهێنا. ئەمانە (کە دەوڵەتانی ڕۆژئاوا ناردبوویانن /ف.) دەورێکی خراپیان لە تێکدانی پەیوەندیی نێوان موسڵمان ونەصرانییەکان دەبینی (ل٢٩٠ بەدواوە). ئاماژەش بۆ کتێبی جۆن جۆزێف" (نەستوورییەکان و دراوسێ موسڵمانەکانیان-١٩٦١) دەکات کە بەدرێژی باسی دەوری ئەو مژدەدەرانە دەکات لە تێکدانی حاڵەتی پێکەوە ژیانی کوردو نەستوورییەکان (ئەوانەی ئێستا بە خۆیان دەڵێن ئاشووری/ ف.) (ل٢٩٢-٢٩٣ پ.١٩٨).

جۆزێف هەروەها باسی کارە دڕندەکانی لەشکری ڕووسیای قەیسەری کاتی گرتنی ڕەواندوز دەکات کەپاش گرتنی شارەکە تەنها لەسەددا بیستی دانیشتووانی کوردی بەزیندوویی مابوونەوە (ل٢٩٨، پ.٢٠٤).(قورم) دەڵێت چەند تیپێکی نەستووری کەپێشتر لەگەڵ دراوسێ کوردەکانیاندا لەهەماهەنگییەکی نایابدا دەژیان بەپاڵ هێزەکانی ڕووسیا شەڕیان دەکرد (هەمان لاپەڕەو پەراوێز).دواتریش کە فەڕەنساو بەریتانیا خیانەتیان لەو تایفە نەصرانییانە کرد (هەروەها لە کورد) شتێکی بەدیهی بوو کوردو تورك زۆر بەتوندی تۆڵەیان لێ بسەندنەوە(ل٢٩٩).

پاش هەموو ئەمانە دیارە شتی خراپ هەن لەگەڵ شوێنکەوتەی ئەو ئایینانە کرابن بەڵام ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەندێ لەوانە ئەو ئازادییەیان خراپ بەکارهێنابوو(بڕوانە وەکو نموونە لاپەڕە ٢٣٠ هەروەها ئارنۆڵد، ل٧٢) یان بەهۆی پەیوەندی بەستن لەگەڵ دوژمنی دەرەوە وەکو نموونەکەی سەرەوە یان ،وەك گۆبینۆ دەڵێت، هۆیەکی سیاسی یان حاڵەتێکی مەزاجیی فەرمانڕەواکە یان خەڵکەکەی لەپشتەوەیەو ئایین تەنها بەهانەیە دەنا ئاین هیچ پەیوەندییەکی پێوە نییە (قورم، ل٢٣٨). لەبارەی ئەم جۆرە کارانەش (بەتایبەت لابردنی زیممییەکان لە کاروباری دەوڵەت) ئارنۆڵد دەڵێت ئەم کارانە بەزووترین کات کۆتاییان پێهات (ئارنۆڵد، ل٧١).

دوو کتێبەکەی سەرەوە شتی زۆریان تێدایە بشێن بۆ نەقڵکردن بەڵام ئەم کتێبە لەمە زیاتر هەڵناگرێت بۆیە لێرەدا دەوستم. کارەساتیشە لەڕاستیدا خوێنەری کورد لەم باسانە بێئاگابێت و قسەی هەندێ نەخوێندەوارو دەمارگیر، تەنانەت قسەی سەرجادەش نەبێت شتی تر نەبیستێت و تەنها ئەم قسانە دووبارە بکاتەوە. هەڵبەت یەکێك لە تاوانبارەکان نووسەری ئیسلامییە کە بایەخێکی وای بەم بابەتە نەداوە یان هەر کاتێك بایەخی پێ دابێت هەقی خۆی پێ نەداوەو خۆی لە پێناویدا وەکو پێویست ماندوو نەکردووە.

* * * * * * *

کەواتە پێویستە ئەو فیکرەیە لە مێشکی خۆمان دەربکەین کە گوایە ڕۆژئاوا کانگەو سەرچاوەی چاوپۆشی و ئازادیی ئایینییەو چیتر بەتەسلیمبوونەوە وانەکانی ئازادی لەوەوە وەرنەگرین و ئەو ڕاستییە گرنگە بزانین کە موسڵمانان کاتێك چاوپۆشییان لەگەڵ ئایینەکانی تر کردووە ئەو موسڵمانانە پابەندی ئیسلام بوون لەکاتێکدا ڕۆژئاوا کاتێك ئازادیی ئایینیی بەخشی کە ئایین هیچ بەهایەکی لا نەماو لەلای ئەو یەکسان بوو مرۆڤ ئایندار بێت یان بێباوەڕ. جیاوازیی نێوان دوو حاڵەتەکەش وەکو جیاوازیی نێوان زەوی و ئاسمانە. ئەگینا کامیان بەخشندەیە" ئەوەی حەزی زۆری هەیە لە شتێك و هەر لەڕێوەو بێ ململانە زۆری لێ دەبەخشێت یان ئەو کەسەی کاتێك شتەکە دەبەخشێت کە لای گرنگ نەبێت؟ ئەمە

ڕاستییەکەیە بەڵام مرۆڤی ئێمە بەردەوام پێی وتراوە تۆ هیچ نیتو ڕۆژئاوا هەموو شتێکە. مرۆڤی ئێمە بەر لەهەموو شتێك کەسایەتییەکەی تێکشکاوە، بەر لەوەش باوەڕەکەی درزی تێکەوتووەو لەم درزەوە کەسایەتییەکەی دەستی بە هەرەسهێنان کردووە.

لە کۆتایی ئەم بەشەشدا دەڵێم ئەو بۆچوونەی، یان ڕاستتر ئەو بوهتانەی دەڵێت فاتحە موسڵمانەکان خەڵکیان بە زەبری شمشێر کردە موسڵمان بۆچوونێکە زیاد لە سەدەیەکە مێژوونووسە بەئینسافەکانی ڕۆژئاوا ڕەتیان کردۆتەوەو بۆچوونێکە دەگەڕێتەوە بۆ سەدە ناوەڕاستەکان تاکو سەدەی نۆزدە کەچی تازە بەتازە زانکۆی سلێمانی لە ساڵی ٢٠٠٢ ی زاینی ئەو بۆچوونە کۆنو هەڵەو دەمارگیرە دووبارە دەکاتەوەو دکتۆرێکی زانکۆ نەخشە بۆ ماستەرنامەیەك لەم بارەوە دەکێشێتو سێ دکتۆری تر پەسەندی دەکەن ، ئەوەش لەلاوە بوەستێت کە ماستەرنامەکە پڕێتی لە ساختەکاری لەبارەی زانیارییەکانو سەرچاوەکان، ئیتر هەق نییە خەفەت بۆ ئەو نەخوێندەوارییەی کوردستان بخورێت؟

## ماستەرنامەکە لەژێر تیشکدا

کورتەی ڕەخنەکانمان لە لێکۆڵینەوەکە ئەمانەی خوارەوەیە:

یەکەم– ((بەئیسلام کردنی کورد)) کە بڕبڕەی پشتی ماستەرنامەکەیە هەڵەیەو ئەو تەرحە سەرلەبەری ماستەرنامەکە هەڵدەوەشێنێتەوە .

دووەم– شوان مامەڵەیەکی نازانستیانە، بگرە نائەمینانەشی لەگەڵ سەرچاوەکاندا کردووە، شوان لەڕادەبەدەر ئەم شتانە زۆر دەکات:

١–ژمارەیەك سەرچاوەی نووسیوە کە نەیدیونو تەنها بۆ زیاد کردنی ژمارەی سەرچاوەکان نووسیونی. بەڵگەکانم لەسەر ئەوە خاڵی (٢)ی خوارەوەیە.

٢–کاك شوان شت دەڵێتو ئاماژە بۆ سەرچاوە دەکات کەچی ئەو شتە لەو سەرچاوەیەدا وجوودی نییە یان باسەکە بەشێوەیەکی ترە. زۆر جار سەرچاوەکە تەنانەت یەك وشەشناڵێت لەوەی شوان نووسیویەتی.

٣–باشترین حاڵەت ئەوەیە زانیارییەك دەنووسێتو ئاماژە بۆ چەند سەرچاوەیەك دەکات کەچی یەکێك یان زیاتر لەو سەرچاوانە ئەو زانیارییەیان تێدایە.

٤–ئیشی نازانستیی تر: کاتەکان تێکەڵ بەیەك دەکات بۆ نموونە وەسفی شوێنێك دەکات بە شێوەیەکی ڕەها لەکاتێکدا وەسفەکە لە سەرچاوەکەدا بۆ سەردەمێکی دیاریکراو هاتووە یان بەجۆرێك وەسفی شوێنەکەدا دەکات وا دەزانی هی کاتی فتووحاتە کەچی هی سەردەمی ترە. شێوازێکی تری مامەڵەی نازانستیش: شتێکی وتووە کە سیغەیەکی گشتکاری هەیە بۆ نموونە: ((خەلیفەکان بەپێی بنەماکانی ئیسلام حوکمیان نەکردووە)) ئاماژەش بۆ سەرچاوەیەك دەکات کەچی سەرچاوەکە بەو شێوە گشتکارە باس لەمە ناکات (بۆ نموونە: باس لەڕەفتاری خەلیفەیەك بەتەنیاو باس لە ڕووداوێکی دیاریکراو دەکات نەك خەلیفەکان بە شێوەیەکی گشتی).

جگە لەوەش شتی تر هەن شایەنی ڕەخنە بن ، ئەوانەی لەگەڵ بنەماکانی لێکۆڵینەوەی زانستیدا ناگونجێن وەکو هەڵەی زۆر لە نووسینی سەرچاوەکانو ناوی خاوەنەکانیان.. تاد بەڵام ئەمانە لە ئاست هەڵەکانی تر بچووك دەبنەوە بۆیە ئەو بایەخەم پێ نەدان.

بۆ ئەو کتێبانەش کە شوان ناوی بردوون، هەوڵم داوە هەمان چاپ بهێنم وتەماشا بکەم، هەندێکیان چاپی ترن بەڵام جیاوازیی چاپ کێشەیەك نییە چونکە تەنها دووان سیانیان کتێبی نوێن و ئەوانی تر کتێبی کۆنن و خاوەنەکانیان نەماون دەستکارییان بکەن بۆیە چاپەکان تەنها جیاوازیی لاپەڕەیان هەیە.

## یەکەم – ئەوەی سەرەکییە

خەم خواردنی میللەت و حەزکردن بە خێروچاکەی هەستێکی ڕەوایە، بەڵام شێواندنی مێژوو ستەمێکە نەك تەنها لە میللەتانی تر بەڵکو پێش هەموو شتێك لەو میللەتە خۆی. پێویستە ڕاستی چۆن بێت مرۆڤ قبووڵی بکات، کوردیش هیچی لە شێواندنی مێژووی دەستناکەوێت غەیری شێواندی ئێستاو داهاتووی خۆی.

وەکو وتم بڕبڕەی پشتی لێکۆڵینەوەکە (بەئیسلام کردنی کورد) هەڵەیەو بەسە بۆ هەڵوەشاندنی هەموو لێکۆڵینەوەکە بەڵام کاتێك مرۆڤ بەدوای ئەو سەرچاوانەدا دەگەڕێت کەنووسەر ئاماژەیان بۆ دەکات و لەگەڵ کتێبەکە بەراوردیان دەکات ئەم تەوەرەیەی لەیاد دەچێت، پاشان، وەکو خۆم، دەکەوێتە گێژاوێك" گێژاوی تەماع چونکە کاتێك فلانە کتێب دەکاتەوەو دەبینێت چ فێڵێك کراوە دەڵێت با ئەو کتێبەی تر ببینم.. بەم شێوەیەش غەرقی ناو ماستەرنامەکەی شوان دەبێت و لەهەمان کاتیشدا لەزەتێکی گەورەی لێدەبینێت، لەزەتی کۆکردنەوەی زانیارییە هەڵەکان.

با جارێ واز لەمە بهێنین و بێینە سەر تەوەرەی یەکەم و سەرەکیی ماستەرنامەی بەئیسلام کردن (ڕاستەکەی: بەموسڵمان کردن) و هەوڵبدەین زۆر بەخێرایی کۆتایی پێ بهێنین.

لەکتێبەکەدا ویستراوە ئەوە بسەلمێنرێت کەکورد بەزۆر کراونەتە موسڵمان بەڵام ئەوەی بەم بۆچوونە نارێکە بنەمای سێ هەڵبژاردنەکەیە: موسڵمانان کە دەچوونە شوێنێك سێ ئیختیاریان دەخستە بەردەم خەڵکەکە: یەکەم: موسڵمان بوون، دووەم: مانەوە لەسەر ئاینی خۆیان و جزیەدان، سێیەمیش: ئەگەر بەهیچیان ڕازی نین شەڕ بەرپا دەبێت.

بنەمای سێ ئیختیارەکە فیکرەی بەزۆر موسڵمانکردنی کوردو غەیری کورد سەرتاپا هەرەس پێ دەهێنێت.

خۆش ئەوەیە کاك شوان و غەیری کاك شوان لەهەمان کاتدا ئەو ڕایەی تریش دەڵێن کەگوایە هۆکاری ئابووری پاڵی بە موسڵمانانەوە نابوو فتووحات ئەنجام بدەن و سامان پەیداکردن مەبەستی سەرەکییان بووە. ئەمە دەڵێن بێ ئەوەی بپرسن: چۆن خۆدەوڵەمەندکردن لەگەڵ ئەوەدا دەگونجێت بەزۆر خەڵك بکرێتە موسڵمان! دیارە ئەگەر موسڵمان بن چیتر جزیە نادەن، بەواتایەکی تر ئەگەر هۆکاری ئابووری پاڵنەری فتووحات بوو بێت ئەوە گونجاوتر دەبێت واز لەخەڵکەکە بهێنن لەسەر ئاینی خۆیان بمێننەوە تا جزیەیان لێوەربگرن، پێش ئەوەش داوای موسڵمان بوونیان لێ نەکەن نەوەکو ببنە موسڵمان و ئەمان دەسکەوتەکانی شەڕیان لەکیس بچێت. ئەم جۆرە ڕخنگرانە تەنانەت ڕەفتاری هەندێك خەلیفەی ئومەوی دەکەنە بەڵگەو دەڵێن ئەم خەلیفانە بینیان خەڵك بەلێشاو دەبنە موسڵمان و بەم جۆرە داهاتی دەوڵەت کەم بووەوە ڕەفتارێکی نائیسلامییانەیان نواند ئەویش هێشتنەوەی جزیە لەسەر ئەم تازە موسڵمانبووانە. ئەمەش بۆ خۆی بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کەس بەزۆر نەکراوەتە موسڵمان.

دیارە شوان دەیزانی بەزۆر موسڵمانکردنی کورد لەگەڵ بنەمای سێ ئیختیارەکە ناگونجێت بۆیە بەهێنانەوەی قسەیەکی بێ بناغە ویستوویەتی خۆی لەم کێشەیە دەرباز بکات.

ئەو دەڵێت مەرج نەبوو ئەم بنەمایە لەهەموو شەڕەکاندا دووبارە بووبێتەوە ((بەڵکو لەزۆر شەڕدا ئەم پرۆسەیە ئەنجام نەدەدرا)) (ل٢٦٩). بەڵگە دەبێ چی بێت؟ شوان بۆ ئەم بڕیارە گەورەیە تەنها یەك نموونە دەهێنێتەوەو دەڵێت((تەنانەت

لەسەردەمی پێغەمبەر (د.خ) یشدا – (د.خ) هی شوان خۆیەتی – ئەو پرانسیپە هەموو جارێك پیادە نەدەکرا، لەغەزوەی بەنی مصطلق، بەفەرمانی پێغەمبەر یەکسەر پەلاماریان دان)) (ل٢٦٩ پەراوێزی ١).

سەیریشە شوان وەکو سەرچاوە ناوی کتێبی (عصر النبوة و الخلافة الراشدة)ی هەردوو دکتۆر(لبید ابراهیمو فاروق عمر)ی هێناوە کە تیایدا باسی ئەو ڕیوایەتە وتراوە کە عەشیرەتی (بەنولموصطەلەق) ویستیان پەلاماری شاری مەدینە بدەن. کەواتە چۆن دەتوانین باس لەو بنەمایە بکەین؟[٥١]

بەڵگەش لەمە لاوازتر نییە چونکە لەم غەزوەیەدا (کە هەروا بە غەزوەی ئەلموڕەیسیع ناسراوە) مەسەلە شەڕی ڕاگەیاندنی ئیسلامو گەیاندنی نەبوو، ڕوایەتەکەی تریش کە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدایە هەیە پێغەمبەر ρ ئەوانی لەناکاو برد[٥٢] کە دیسان ئەو مەبەستە ناگەیەنێت چونکە ئەمانە دەمێك بوو بانگەوازی ئیسلامیان پێ گەشتبوو جگە لەمەش دەشێت عەشیرەتەکە خۆیان بۆ شەڕ ئامادەکردبێتو موسڵمانان لەناکاویان بردبن. بە هەر حاڵ فەرموودەی صەحیحی ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر ρ سەبارەت بە سێ ئیختیارەکە هاتووە[٥٣]. جگە لەوەش ئاموژگارییەکەی پێغەمبەر ρ بۆ عەلی لە غەزوەی خەیبەردا هەیە کە دەڵێت: پەلە مەکە تا دەچیتە گۆڕەپانەکەیان پاشان بانگیان بکە بۆ ئیسلام..[٥٤] غەزوەی خەیبەریش دوای غەزوەی ئەلموڕەیسیع بوو، واتە حوکمی بانگکردنی خەڵك بۆ ئیسلام پێش شەڕ هەر مابوو.

جگە لەوەی شوان نموونە لەفتووحات ناهێنێتەوە لەسەر ئەوەی بنەمای سێ ئیختیارەکە ((هەموو جارێك پیادە نەدەکرا))و جگە لەوەی لەسەردەمی پێغەمبەرەوە ρ نموونەیەك دەهێنێتەوە کە بۆ حاڵەتی مەبەست ناشێت، دەبینین بازێکی گەورە دەداتو گریمانەیەکی گەورە لەسەر ئەم بێ سەرو بەرییە بینا دەکاتو دەڵێت ڕەنگە هۆی پیادە نەکردنی ئەو بنەمایە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە موسڵمانان لەوە ترسان خەڵکەکە ببنە موسڵمانو بەم شێوەیە دەستکەوتو تاڵانییەکانیان لەدەست بچێت (ل٢٦٩)[٥٥].

ئەم ڕەخنەیەمان، وەکو وتم، بەسە بۆئەوەی تەواوی ماستەرنامەکە بێ بەها بهێڵێتەوە بەڵام ئەمەیان تەنها ئەوەی سەربەڕەیەو ئەوەی بن بەڕە گەورەترە.

ڕەخنەیەکی کوشندەی تر بەو جۆرە بیرکردنەوەیەی کاك شوانی جووڵاندووە بریتییە لە پرسیاری لەبارەی مانەوەی خەڵکی وڵاتە فەتحکراوەکان لەسەر ئاینی خۆیان. چ لەم کتێبەی شوانو چ لەکتێبی تری کوریدا ئەوەی دەوترێت کە کورد بەرەنگاریی بە موسڵمانکردیان کردووەو تا ماوەیەکی زۆر لەسەر ئاینی زەردەشتی مانەوە. ئەمەش واتایەك دەگەیەنێت کە ئەو کەسانە بەدوایدا ناچن: سەرەڕای دەسەڵاتە گەورەکەی دەوڵەتی ئیسلامیو سەرەڕای ((بە موسڵمان کردن)) کورد بەرەنگارییان کرد، کە ئەمەش یەکسانە بە نەبوونی زۆرەملێ!!

شوان خۆی دان بەوەدا دەنێت کە زۆر لە شارو شارۆچکە کوردییەکان جزیەیان دا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر سووربوونیان لەسەر ئاینەکەیان(ل٢٣٧پەراوێزی ١)، ئیتر ((بەموسڵمانکردن))ی کورد لەکوێدا بووە؟ ئەی بایەخی ماستەرنامەکەی شوان چەندی دەمێنێت؟

کۆتایی ئەم ڕەخنەیەم لە تەوەرەی سەرەکیی ماستەرنامەکە بە ڕوونکردنەوەیەك دەهێنم. حەز دەکەم هۆکاری ئەوە ئاشکرا بکەم کە بۆچی شتی دژ بەیەك دەوترێن:

---

[٥١] چاپی سێیەمی ئەو کتێبەم لایە (١٩٨٤) کە هی (د. لبید)و(د.ابراهیم نمیر) ـە کە ئەمیان بەشێکی کتێبەکەی نووسیوەو پاشان کۆچی دوایی کردووە. شوانیش چاپی (١٩٨٧) دەنووسێت.

[٥٢] صحیح البخاری، جزء ٣، في العتق و فضله ، صحیح مسلم، جزء ٥، كتاب الجهاد والسير، باب جواز الاغارة على الكفار الذين بلغتهم دعوة الاسلام من غير تقدم الاعلام بالاغارة.

[٥٣] صحيح مسلم، جزء ٥، كتاب الجهاد والسير، باب تامير الامام للامراء...

[٥٤] صحيح البخاري، جزء ٤، باب فضل الجهاد والسير، باب دعاء النبي ρ الى الاسلام والنبوة...

[٥٥] شوان وشەی دەستکەوت بۆ (الفئ) بەکاردەهێنێت کە ئەمە هەڵەیە چونکە دەستکەوت واتایەکی گشتیی هەیە لەکاتێکدا وشە عەرەبییەکە جۆرێکی تایبەتی دەستکەوتە.

مەبەستی ئەو کەسانە لەباسی فتووحات تەنها ڕەخنەو ڕەفزە نەك گەشتنە بەڕاستی بۆیە دەبینین لەلایەك دەڵێن ئیسلام ئاینی کورد نییەو بەزۆر لەلایەن عەرەبە موسڵمانە داگیرکەرەکانەوە بەسەرماندا سەپێنراوە: ((یان موسڵمان بوون یان شمشێر))، بەڵام لەهەمان کاتدا دەڵێن عەرەب لەبەر هۆکاری ئابووری فتووحاتیان بەرپا کردو مەبەستیان بوو تالانی بکەن و باج و جزیە لەخەڵك وەربگرن. لەلایەك دەڵێن: یان شمشێر یان موسڵمان بوون و لەلاکەی ترەوە دەڵێن کورد تا سەدان ساڵیش دوای فتووحات هەر ئیسلامیان قبووڵ نەکرد (بەم جۆرەش تیۆری شمشێر ڕەت دەکەنەوە بێ‌ئەوەی بەخۆیان بزانن).

مرۆڤیش کە گەیشتن بەڕاستی مەبەستی نەبوو ناچارە ڕێگەی پێچاوپێچ بگرێتە بەرو بەمە خۆی تووشی ناڕێکی دەکات. دواتر (یان ڕەنگە پێشتر) ئەمە تێکەڵ بەفرۆفیشاڵێکی زۆرو نەخشاندنی وێنەیەك بۆ شەڕەکان بەجۆرێك کورد دەوری گەورە لەبەرەنگاری دەبینێت و باقی میللەتانی‌تر لاوەکیترین دەوریان پێ دەدرێت، تەنانەت دەوڵەتێکی گەورەی ئەو سەردەمە، مەبەست دەوڵەتی ساسانییە، دەورەکەی بچووك دەبێتەوەو هەست دەکەی وجودی لەوکاتەدا ئەگەر شتێکی زیادەش نەبێت گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەسەر ((ڕاستییەکان))دا نەهێناوە. لەمەشەوە ئەو کوردانەی لەلەشکری ساسانیدا شەڕیان دژی موسڵمانەکان کردبوو دەبنە کوردپەروەرو بۆ کوردستان شەڕیان کردووە نەك بۆ پاراستنی تەختی ساسانییەکان هەروەك چۆن فارسەکان خۆیان دەبنە هاووڵاتیی نیشتیمانپەروەر نەك ئامێرێك بەدەست پادشاکانیانەوە. پێشتریش باسی ئەم شتانەم کردو ئەم چەند ڕستەیە لێرەدا بەسە.

## دووەم – وەکو ئیشەکانی قوتابییەکی ناوەندی

مامۆستاکان باش لەفێڵەکانی قوتابییەکانیان شارەزان. ئەم قوتابیانە کاتێك ڕاپۆرتیان بەسەردا دەدرێت فێڵ لەسەرچاوەکان دەکەن. لەمەشدا ناتوانین لۆمەی قوتابیان بکەین چونکە تەنانەت هەندێك نووسەریش ئەمەیان پێ شەرم نییەو دروشمەکەیان لەم کارەدا ئەوەیە ((کێ پێی دەزانێت))، بەڵام ئێوە چی دەڵێن ئەگەر کاری وا لەنامەیەکی زانکۆدا کرابێت؟

فێڵ کردن لەسەرچاوە چەند جۆرێکە. جاری وایە نووسەر زانیارییەکە لەسەرچاوەیەکدا دەبینێت و نەقڵی دەکات بەڵام چونکە سەرچاوەکە لاوازە ناوی نابات بەڵکو ناوی ئەو سەرچاوەیە دەنووسێت کەلەسەرچاوە لاوازەکەدا دەیبینێت، خوێنەریش بەم جۆرە وا دەزانێت ئەم سەرچاوەیەی دیوە. ئەم کارەش لەزانستی فەرموودەناسیدا (علم الحدیث) پێی دەوترێت تەدلیس.

جۆرێکی تری فێڵ ئەوەیە نووسەر زانیارییەکە لەسەرچاوەی (س)دا دەبینێت و ئەمیان لەسەرچاوەی (ك)ەوە وەرگیراوە، نووسەریش هەردوو سەرچاوەی (س)و (ك) پێکەوە دەنووسێت و خوێنەر وا تێدەگات نووسەر هەردوو سەرچاوەکەی بینیوە.

کاك شوان ئەم کارانەی بەردەوام کردووە. کلیلی زانینی ئەمەش قسەیەکی شوانە لەموناقەشەی ماستەرنامەکەیدا. دکتۆر (حسام الدین) ئەو تێبینییەی هەبوو بۆ یەکێك لەزانیارییەکان کە لەئەسڵدا لەکتێبەکەی (یاقوت الحموی)دایە بەڵام شوان ناوی سەرچاوەیەکی تری بردووە کەئەمیش بۆ خۆی لەیاقووتی وەرگرتووە ئیتر بۆچی شوان هەر ناوی کتێبەکەی یاقووتی نەهێنا؟ شوان لەوەڵامدا وتی: مامۆستا ناکرێ هەموو جارێك بڵێم (یاقوت الحموی).. (یاقوت الحموی) ئەمەم لەبەر (تنوع المصادر) کرد.

ئەم کارەی شوان بۆ خاتری (تنوع المصادر) پێشەی بەردەوامی بوو. لەڕاستیشدا چاوەڕێم نەدەکرد شتی وا لە نامەیەکی زانکۆدا بکرێت، هەرچەندە شتێکی وام لە نووسینی خەڵکدا دەبینی.[٥٦] لەم بابەتەشماندا خوێنەر شتی زۆر لەم جۆرە دەبینێت. کاك شوان لەبەر (تنوع المصادر) ژمارەیەك سەرچاوەی نووسیوە کە نەیدیون، ئێمەش ئەو سەرچاوانە بەبەڵگەوە دەژمێرین. زانیارییەکانی کاك شوان یان هەڵەن و یان لەو سەرچاوانە وجودیان نییە بۆیە مرۆڤ بەئاسانی دەگاتە ئەو ئەنجامەی کاك شوان ئەو سەرچاوانەی نەدیوە.

ڕەخنەکانم لە سەرچاوەکان و لە زانیارییەکانی کاك شوانم کردووە بە دووبەش:

یەکەمیان: کاك شوان شتێك دەنووسێت و ئاماژە بۆ چەند سەرچاوەیەك دەکات. منیش یەك بەیەکی سەرچاوەکانم هێناوە تا بیسەلمێنم زانیارییەکە لەو سەرچاوانەدا نییە یان ئەگەر هەبێت بەو شێوەیە نییە کە شوان نووسیویەتی. ئەم بەشەشم ناو ناوە: **پەراوێزەکان بەکاملی**.

بەشەکەی تریش ئەوەیە لەناو ئەو سەرچاوانە تەنها یەکێکیانم وەرگرتووەو ئەو کارەی سەرەوەم لەسەر کردووە. ئەمەشم بۆیە کردووە چونکە کاتێکی کەمتری دەوێت. ئەم بەشەشم ناو ناوە **هەڵبژاردەی کتێب**. ڕەنگە کاك شوان بڵێت: لەناو (بۆ نموونە) سێ سەرچاوە با زانیارییەکە لە یەکێکیاندا نەبێت ، خۆ لە دوانەکەی تردا هەیە. منیش دەڵێم: یەکەم شت دڵنیات دەکەم لە زۆر حاڵەتدا لە دوانەکە تریشدا نییە، بەشی (پەراوێزەکان بە کاملی)شم بۆ ئەم مەبەستە داناوە، دووەم شتیش ئەوەیە بەسە بۆ مرۆڤ بەردەوام لەناو سێ سەرچاوە لە یەکێکیاندا ئەمانەت نەپارێزێت بۆ ئەوەی بەرهەمەکەی بەهای نەمێنێت.

بۆ تەرتیبی کتێبەکان و زانیارییەکان گوێم نەداوەتە تەرتیبی لاپەڕەکانی شوان یان لێکچوونی بابەتەکان یان کۆنی و تازەیی کتێبەکان.. بەڵکو چیم هاتۆتە بەردەست دامناوە.

ئێستاش بە بەشی دووەم دەست پێ دەکەم و ژمارە (١)ی دەدەمێ و دواتر دەچمە سەر بەشی (پەراوێزەکان بە کاملی).

---

[٥٦] یەکێك لەوانە نووسینی لاوێك کە عەرەبییەکەی باش نییە کەچی وەکو سەرچاوە کتێبێکی ئەفلاتوونی نووسیبوو ئەویش بەفەرەنسی! پیتە لاتینییەکانیشی وەکو خەتی مسماری نووسیبوو. بەڵام با گلەیی لەم نەکەین چونکە کاتی خۆی ئەم جۆرە ڕەفتارەم لە مامۆستایەکی زانکۆی خاوەن بڕوانامەی دکتۆراش بینیوە!

# ١-هەڵبژاردەی کتێب

لەم بەشەدا ژمارەیەك سەرچاوە وەردەگرم‌و وەك ڕوونم کردەوە لەجیاتی ئەوەی زانیارییەکە بهێنم‌و یەك بەیەك لەو سەرچاوانە بکۆڵمەوە کە بۆ زانیارییەکە نووسراون تەنها یەك سەرچاوەیان وەردەگرم تا بیسەلمێنم کە شوان ئەو سەرچاوەیەی نەدیوە یان ئەگەر دیبێتی لێی تێنەگەشتووە یان بۆ مەبەستێکی دیار دەستکاریی قسەکانی کردووە.

بۆ ئەم بەشە ئەمسەر تا ئەوسەری کتێبەکەی کاك شوان گەڕاوم‌و هەوڵم داوە هەموو جارێك سەرچاوەکە ناوی هاتبێت تەماشای قسەکەی کاك شوان بکەم‌و لەگەڵ سەرچاوەکە بەراوردی بکەم. هەڵبەت بۆ ژمارەیەك سەرچاوە تەنها چەند نموونەیەکم وەرگرتووە چونکە وەرگرتنی هەموو نموونەکان کتێبەکەمان دووردرێژ دەکات، هەروەها جاری وایە قسەکەی شوان ڕاست دەبێت. بەڵام با ئەوەش بزانین کە ئەگەر (بۆ نموونە) لە چوار جار بەکارهێنانی سەرچاوەی (س) یەك جار بەکارهێنانەکە ڕاست بێت ئەم جارە ڕاستە سیانەکەی تر پڕناکاتەوە. لەم بەشەشدا بۆ هەر خاڵێك نووسیبێتم (بە تەنیا) واتا بۆ ئەم زانیارییە شوان تەنها ئەم سەرچاوەیەی نووسیوە.

لەم بەشەدا زیاد لە پەنجا کتێبم وەرگرتووە، هێشتا زۆریشم بۆ ڕەخنەگری تر جێهێشتووەو ڕەخنەگران دڵنیا دەکەمەوە کە شتی زۆریان دەست دەکەوێت بەو مەرجەی سەرچاوەکانیان دەستبکەوێت، وەکو وتیشم کتێبەکەی کاکە شوان بەهەشتی ڕەخنەگرانە. سەرنجی خوێنەریش بۆ ئەوە ڕادەکێشم کە لێرەدا هەندێ جار نەبێ موناقەشەی زانیارییەکان ناکەم بەڵکو تەنها موناقەشەی ئەوە دەکەم ئایا ئەو سەرچاوەیەی کاك شوان ناوی بردووە ئەو شتەی تێدایە کە کاك شوان نووسیویەتی یان نا، هەروەها ئەگەر سەرچاوەکە باسی کردبێت چۆنی کردووە.. لێرەدا تەنها موناقەشەی بەکارهێنانی سەرچاوەکان دەکەم.

**نموونەی یەکەممان** کتێبی (الدولة العربية وسقوطها) لەنووسینی (ڤێلهاوزن)ـە

کاك شوان ناوی ئەم کتێبەی نووسیوە بێ ئەوەی دیبێتی. کاك شوان لەپەراوێزی (٣)ی لاپەڕە (٢٧٦) دەڵێت:

((بەڵکو عەرەب کۆمەڵگەی بەڕێوەبردنی و کاربەدەستانی دەوڵەت بوون))و دوو سەرچاوە بۆ ئەمە دەهێنێتەوە بەم جۆرە: فلهاوزن: الدولة العربية وسقوطها، لا١٩٠-١٩٢، د. محمد بديع شريف: الصراع بين الموالى والعرب، لا٣٥.

با ئەمە تاقی بکەینەوە.

هەمان چاپی عەرەبیی کتێبەکەی ڤێلهاوزن (دیمەشق ١٩٥٦) کە کاك شوان ناوی بردووە بهێنەو تەماشای لاپەڕە ١٩٠-١٩٢ بکە بزانە چی دەڵێت. ئەو لاپەڕانە باسی شۆڕشەکەی (ابن الاشعث)یان تێدایەو هیچ شتێك لەو قسەیەی کاك شوانیان تێدا نەهاتووە. شتێك لەم بابەتە دەیان لاپەڕە پێش ئەوەو لەپێشەکییەکەدا هەیە. پاشان تەماشای سەرچاوەی دووەم بکە، واتە کتێبەکەی د. محمد بديع (ل٣٥) ئەویش هەمان چاپ (١٩٥٤) دەبینی دیسان ئەم قسەیە نەهاتووە. جوان کتێبەکەی سەیر بکە دەبینی لەلاپەڕە ٣٣-٣٤ قسەیەکی ڤێلهاوزن دەهێنێتەوە لەبارەی سەرقاڵبوونی ئومەوییەکان بەبزاڤی مەوالییەکان .. تاد ئینجا د. محمد پەراوێزی (١)ی بۆ ئەم قسەیەی ڤیلهاوزنی داناوەو نووسیویەتی: ولهوزن، الدولة العربية وسقوطها، ص ١٩٢!

کورتەی مەسەلەکەو هەڵەکەی کاك شوانیش بەم جۆرەیە:

١-د. محمد بديع چاپی ئەڵمانیی کتێبەکەی ڤیلهاوزنی بەکارهێناوە بەڵام لەناواخنی باسەکاندا پەراوێزەکانی بەعەرەبی نەك بەئەڵمانی نووسیوە بۆیە دەبێت (ل١٩٢) هی چاپی ئەڵمانی بێ، ئینجا لەبەرئەوەی کاك شوانی پەراوێزەکەی بەعەرەبی بینیوە وای زانیوە چاپی عەرەبی بەکارهاتووە بۆیە ناوی چاپە عەرەبییەکەی لەشوێنێکەوە هێناوەو

زانیارییەکەی لە د. محمد نەقڵ کردووە (بەسەقەتی و دەستکاریکردنەوە) و نووسیویەتی فلهاوزن، الدولة العربیة وسقوطها، ل ١٩٠-١٩٢.

نموونەیەکی تری تایبەت بەکتێبەکەی فێلهاوزن لەلاپەڕە (٢٨٩)دا دەیبینین. لەپەراوێزی لاپەڕەکەدا کاک شوان لێکدانەوەی زاراوەی (مەوالی)مان بۆ دەکات و ئاماژە بۆ ڤێلهاوزن لاپەڕە (١٧٤) دەکات. بەڵام لاپەڕە (١٧٤)ی هەمان چاپ کەکاک شوان ئاماژەی بۆ کردووە باسی شتێکی زۆر دووتر دەکات، باسی دروستکردنی (قبة الصخرة) و جێ و پایەی (قودس) دەکات. تومەز د. محمد بدیع لەلاپەڕە (٢٣) کتێبەکەی خۆیدا ئەم لێکدانەوەیەی ڤێلهاوزنی هێناوەو ئاماژەی بۆ لاپەڕە (١٧٤) کردووە کەهی چاپی ئەڵمانییە.

لاپەڕە (١١٣)ی ماستەرنامەی کاک شوان نموونەیەکی سێیەمی تێدایە. زانیارییەکەی کاک شوان لەسەر پێگەی بزاڤی (خوڕڕەمییەت)ەو پەراوێزی (١) بۆ کتێبەکەی ڤێلهاوزن، لاپەڕە ٨٩ دادەنێت. بەڵام ئەم زانیارییە لەو کتێب و لاپەڕەیەدا نییە. ئەو لاپەڕەیە باسی شەڕی حەسەن وموعاویە دەکات واتە هێشتا سەردەمی ئومەوی نەهاتووە چ جای سەردەمی عەبباسی کە تێیدا خوڕەمییەت سەری هەڵدا. کتێبەکەش ئەسڵەن باسی سەردەمی عەبباسی ناکات. نەوەکو ژمارەکەش هەڵەی چاپ بێت هەموو ئەم لاپەڕانە گەڕام وهیچم تێیاندا نەدۆزییەوە: ٩٨، ١٨٩، ١٩٨، ٢٨٩، ٢٩٨، ٣٨٩، ٣٩٨، تەنانەت سەیری پێرستی ناوەکانیشم کردو هیچم تیا دەستنەکەوت، ئەی دەبێت ئەمەی لەکوێوە هێنابێت؟ نەمتوانی بزانم[٥٧].

**دوو: پاشان کتێبی (فارسنامە) هەیە.**

کاک شوان چەند جارێك لەکتێبەکەیدا ئاماژە بۆ کتێبی (فارسنامە)ی (ابن البلخی) دەکات کە کورد چ پێگەیەکی لەدەوڵەتی فارسدا هەبووە. لەلاپەڕە (٢٣٨)دا بۆ نموونە دەڵێت:

((لەنێو گەلانی ئێرانیشدا کورد توانیبووی شوێنی دەستی خۆی لەبوارە جیاجیاکاندا بەڕوونی دیار بکا)) وناوی کتێبی (فارسنامە) ل١٨٦ و نامیلکەی (کوردناسی) لەنووسینی (ئاورنگ)[٥٨] ل٢١ دنووسێت. بەڵام (ئاورنگ) باسی ژمارەی زۆری کوردەکانی وڵاتی فارسی زەمانی زوو دەکات: ((ئەمانە لەناو لەشکری پارسدا دەرکەوتووبوون و ئەسپ و چەك و تفاقی جەنگی چاکیان بەدەستەوە بووە..)).

قسەکان ئاوا دەستکاری کراون! کاک شوان بەو دەستکاریکردنە ناوەستێ و دەڵێ ((واتە کورد بەهیچ شێوەیەك بەشارستانییەت نامۆ نەبووەو خاوەنی کولتورێکی پێشکەوتووش بووە))، بۆ ئەم قسەیەش ئاماژە بۆ کتێبی نووسەرێکی کورد دەکات!

(ئاورنگ) لەو قسەیەی سەرەوەیدا ئاماژە بۆ هەمان کتێبی (فارسنامە) و لاپەڕە ١٨٦ دەکات! کاک شوان هەمان ڕەفتار لەلاپەڕە (١٤٨) و (١٩٥) دەکات و ئەم جارە ناوی سەرچاوەی تر دەبات بەپاڵ (فارسنامە) و (کوردناسی). لەشوێنی تریشدا بەهەمان شێوە (فارسنامە) دەنووسێت لەهەمووشیاندا هەر دەڵێت (لاپەڕە ١٨٦). بە پێی ئەم بەڵگانەو بەڕای خۆم کاک شوان (فارسنامە)ی نەدیوەو ژمارەی لاپەڕەکەی لە نووسراوەکەی ئاورنگ وەرگرتووە.

**سێ- کتێبی (نخبة الدهر في عجائب البر والبحر) لەنووسینی (شیخ الربوة):**

گوایە کاک شوان بەکاری هێناوە هەرچەندە ناوی لەسەرچاوەکاندا نەبردووە.

١- لاپەڕە ١٨ی کتێبەکەی شوان: لەبارەی نیشتەجێبوونی کورد لەهەرێمی جەزیرە. ناوی (نخبة الدهر) ی هێناوەو لاپەڕە (٢٥٥). لەڕاستیشدا یەك وشە لەبارەی جەزیرەوە نەهاتووە، تەنها باسی کوردە.

---

[٥٧] گومانم لەکتێبەکەی (البابکیة)ی (د. حسین قاسم العزیز) هەبوو کە کاک شوان ناوەکەی وا دەنووسێت: دکتۆر قاسم حسین عەزیز هەروەها لەلیستی سەرچاوەکاندا هەڵە لەدوو دەزگای چاپکردنی دەکات و ساڵی دەرچوونی نەنووسیوە کەئەمە بۆ خۆی جێگەی تێبینیە. چاپی یەکەمی کتێبی (١٩٦٦) بووەو نامەی دکتۆرایە لەمۆسکۆ.

[٥٨] کتێبی (کوردناسی) وەکو کتێبەکانی‌تر پڕە لەزانیاریی هەڵە یان بێ بناغە.

٢–ل٣٦ شوان: ((موسڵ لەسەردەمی فتووحاتەوە هەتا سەردەمی خەلیفە هارون ڕەشیدی عەبباسی شارەزووریشی لەخۆگرتبوو)) – نخبة الدهر ل١٩٠.

بەڵام لاپەڕەکە باس لەمووسڵ دەکات لەکاتێکدا باسی شارەزوور لەلاپەڕە (١٨٤)دایەو تێیدا وتراوە هاوسنووری مووسڵەو وتراوە کە (زور بن الضحاك) دروستی کردووە.. تاد.

دواییش شوان لەلاپەڕە ٣٧ هەمان هەڵەی دووبارە کردۆتەوە[59].

٣–ل٣٧ شوان: لەبارەی شارەزوورەوە دەڵێت زۆر لەمێژوونووسان (..) دەڵێن دەکەوێتە نێوان هەمەدانو مووسڵ – نخبة الدهر، ل١٩٠.ئەو لاپەڕەیەی (نخبة الدهر)یش ئەوە لەبارەی شارەزوورەوە دەڵێت کە لە خاڵەکەی سەرەوەدا بینیمان.

٤–ل٣٦ شوان: کاك شوان باسی مووسڵ دەکات کە بەر لەفتووحاتو هاوکاتی فتووحات دوو قەڵای بووە (کە ئەمە ڕاستە) بەڵام دواتر دەڵێت قەڵای خۆرهەڵاتیان موسڵ بووە (بۆ ئەم زانیارییەی دوایی نخبە الدهر، ل١٩٠، بەتەنیا دەنووسێت)و خۆرئاواش نەینەوا بووە.

بەڵام نخبة الدهر ڕێك پێچەوانەی ئەمەی تێدایە: پێش فەتح دوو قەڵا بوو، ڕۆژهەڵاتیان نەینەوای پێ دەوترا (..)و ڕۆژئاائاواکە پێی دەوترا مووصڵ.

٥–ل٣٨ شوان: باسی شاری (تیران شاە) ی نزیك شارەزوور دەکات کە ((بە دوویشکە بکوژەکانی بەناوبانگە)) –نخبة الدهر ل١٨٤. شتی واش لەکتێبەکەدا نییە. تەنانەت ناوی (تیران شاە)یشی تێدا نییە.

تێبینی: ئەوەی ل١٨٤ی (نخبة الدهر)و کە باسی شارەزووری تێدایە تەنها یەك دێڕە.

٦–ل١٣٧ شوان: باسی شەڕی قوبادی ساسانیو بیزەنتییەکانو گرتنی ئامەدو گواستنەوەی خەڵکەکەی بۆ ئەررەجان ((بەڵام ناچار بوو ئاشتی لەگەڵ بێزەنتییەکان بکات بەهۆی هێرشی لەناکاوی هۆزەکانی هۆن)) – نخبة الدهر ل١٧٧.

ڕاستیی زانیاریی ناو (نخبة الدهر)یش ئەوەیە قوباد قەنتەرەیەکی دروستکردبووو خەڵکی (ئامەد)ی بۆ ڕاگواست، کتێبەکەش و باسەکەش جوگرافییە نەك مێژوویی ئیتر نەباس لەشەڕو ئاشتیو نە لەهۆزەکانی (هون)..ی تێدا نییە.

## چوار– (شذرات الذهب في اخبار من ذهب)ی (ابن العماد الحنبلي):

ئەوەی بیدیومە شوان لە یەك شوێندا ئەم کتێبەی وەك سەرچاوە نووسیوە.

ل٢٠٠ شوان: ((بۆچوونێکی تریش دەڵێ دوای نەهاوەند خەڵك گەڕانەوە هەرێمەکانیانو ئۆردوی کوفە لەگەڵ حذیفة مانەوەو پەلاماری ئازربیجانیان داو دواتر لەسەر ئەوە ڕێککەوتن ساڵانە ٨٠٠ هەشت سەد هەزار درهەم بدەن بەعەرەبەکان) – شذرات الذهب ج١/ل ٣٢.

جارێ کتێبەکە مێژوویەکی زۆر کورتە. بەسیشە بزانین کەبۆ ساڵی (٢٢)ی کۆچی تەنها پێنج دێڕ تەرخانکراون.لەو لاپەڕەیشدا وتراوە: لەو ساڵەدا ئازەربایجان لەسەر دەستی (المغیرة کوڕی شعبة) گیراو شاری نەهاوەند بەصوڵح، دینەوەرو هەمەدانیش بەشەڕ لەسەر دەستی حوذە یفە..

## پێنج: (تاریخ الموصل) لەنووسینی (الازدي):

ل٤٤ شوان: کاك شوان باس لە (سنجار) دەکات و دەڵێت ((بەڵام ئەو سەردەمەی ئێمە لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەین سەر بەئوستانی موسڵ بووە) – الازدي ج٢/ل٣٣.

---

[59] وەکو وتم لەم بەشەی هەڵبژاردەی کتێبەدا هەندێ جار نەبێت قسەم لەسەر زانیارییەکان نەکردووە چونکە مەبەستی من لێرە مامەڵەی شوانە لەگەڵ سەرچاوەکاندا، دەنا بۆ نموونە ئەوەی لاپەڕە ٣٧ دوو سەرچاوەی تری بۆ نووسراوە: فتوح البلدان، ل٣٢٩ء الخراج وصناعة الکتابة، ل٣٨٣و ئەو زانیارییەیان تێدایە (بەڵام یەکەمیان دەڵێت ئەم جیاکردنەوەیەی شارەزوور لە مووسڵ لە کۆتایی حوکمی هارون الرشید بوو). بێگومان هەر لەم بەشەدا زانیاری هەیە لە هیچ لەو سەرچاوانەدا نییە کە شوان نووسیونی بەڵام باسکردنی ئەمە یان باسکردنی پێچەوانەکە، واتە زانیارییەکەیان تێدایە کاری ئەم بەشە نییە بەڵکو هی بەشەکەی ترە: پەراوێزەکان بەکاملی.

ئەو کتێبە لەئەسڵدا سێ بەشەو تەنها بەشی دووەمیان ماوە[٦٠]. دوو تەرتیبیش بۆ ژمارەی لاپەڕەکان دانراوە یەکەمیان هی نووسەری کتێبەکەیەو ئەوەی تریان هی (محقق)ەکەی. لاپەڕە (٣٣)ی تەرتیبی (محقق) پەڕەیەکی سپییەو لاپەڕە (٣٣)ی نووسەر تەنها ناوی سنجار لەگەڵ چەند شوێنێکی‌تر هاتووە کە سەر بە مووسڵە. بەڵام ئەمە لەڕووداوەکانی ساڵی (١١٣)ی کۆچیدا باسکراوە لەکاتێکدا ئەو سەردەمەی کەشوان لێکۆڵینەوەکەی لەبارەوە ئەنجامداوە زیاد لەنەوەد ساڵ پێش ئەوەیە. ئینجا ئەگەر ئەمە نیشانەی ئەوە نەبێت کتێبەکەی نەدیبێ دەبێ نیشانەی چی بێت؟ ئەوەشی دیومە شوان یەك جار ئەم کتێبەی نووسیوە (ناڵێم بەکاریهێناوە!).

**شەش-(کتاب قرة العين من تاريخ الجزيرة والعراق والنهرين)ی (محمد رشيد سعدی)**

سەرەتا شوان لەسەرچاوەکاندا (ل٣٠٥) ناوی نووسەرەکەی وا نووسیوە(محمد رشيد بن العالم السيد داود الزاهد السيد السعدي) لەکاتێکدا ناوی نووسەر لەسەر کتێبەکە بەم جۆرەیە (محمد رشيد بن العالم العامل المرحوم السيد داود بن الورع الزاهد السيد سعدی). هەڵەی نەقڵ بەهەرحاڵ بەڵام شوان نەیزانیوە کە (العالم العامل) دوو وەسفن بۆ (السيد داود)و واتاکەیان ئەوەیە کەزانایەو کار بەعلمەکەی دەکات (ئەمەش تەعبیرێکی نووسینە ئیسلامییەکانە)و کاك شوان وایزانیوە (العالم) ناوە یان نازناو، هەمان شتیش بۆ باپیری محمد رشيد (السيد سعدی) کە وەسفی (الزاهد)ی بۆ نووسراوە ئەمەش جگە لەوەی ئەمەیان لای کاك شوان بۆتە باوکی (محمد رشيد). ئینجا بزانین جگە لەوە چۆن مامەڵەی لەگەڵ کتێبەکەدا کردووە.

١-ل٢١ شوان: لەبارەی نەسیبینەوە[٦١] دەڵێت بەر لە ئیسلامبوون مەسیحیو جوولەکە بوون‌و پاشان دەڵێت ((چونکە نوێنەری حەزرەتی مەسیح لەکاتی ژیانی مەسیح هاتۆتە ئەم شارو ناوچەیە هەروا دوای مەسیحیش بڵاوکردنەوەی ئەم ئاینەیان لەئەستۆ گرتووە)) - قرة العين ل١٨-١٩ (بەتەنیا).

خاوەنی (قرة العين) لەڕاستیدا چی دەڵێت؟ ئەو تەنها دەڵێت کەئەمڕۆ (کاتی نووسەر) زۆربەی خەڵکەکەی موسڵمانن‌و کەمێك جوولەکەو نەصرانیی تێدایە، هەموو باسەکەی نەسیبینیش کەمترە لەچوار دێڕ(وەکو باقی شارەکانی تر چونکە کتێبێکی بچووکە) ئیتر نەباسی هاتنی نوێنەری مەسیح (سەلامی خوای لێ بێت)و نەباس لەبڵاوکردنەوەی ئاینەکەی کراوە[٦٢]. بڕوانە کە لە سەرەوەدا ئاماژەی ((بەتەنیا))مان دانا، واتە تەنها ئەو سەرچاوەیەی نووسیوە نەك لەگەڵ سەرچاوەی تردا تابڵێین ئەم زانیارییەی لەو سەرچاوانە وەرگرتووە، هەرچەندە ئەمەشی بکردایە هەر هەڵە دەبوو چونکە پێویستە بۆ زانیارییەك ئاماژە بۆ دوو سەرچاوە نەکرێت ئەگەر لەیەکێکیاندا بەکورتی هاتبێت، خۆ ئەگەر زانیارییەکە لەو یەکەیاندا نەبێت ئەوا هەروەکو ئەوەیە بەتەنیا ناوی بردبێت‌و وەکو حاڵەتەکەی ئێستای خۆمان بەڵگە دەبوو لەسەرئەوەی کتێبەکەی نەدیوەو ئەو قسەیەی لەسەرچاوەیەکی ترەوە نەقڵ کردووە. پاش ئەوەش ئەگەر زانیارییەك یان زیاتر بەڕاستی نەقڵ بکات دیسان تۆمەتەکەی لەسەر لاناچێت چونکە یەك بەڵگە لەم بارەیەوە بەسە بۆ تاوانبارکردنی نووسەر.

٢-ل٢٢ شوان: نەسیبین ((بە دووپشکە کاریگەرو بکوژەکانی بەناوبانگە)) قرة العين، ل٢٥-٢٦.

بەڵام نەسیبین ل١٧-١٨ باسکراوە (تێبینی ئەوە بکە ئەمە هەمان چاپە)و لەلاپەڕە (١٨)دا نووسراوە دووپشکی بکوژی تێدایە نەك بەو دووپشکانە ناسرابێت.

٣-ل٢٤ شوان: لەپەراوێزدا باس لەشاری حەڕڕان کراوە گوایە ناوی (بەهاران) بووو ئەمەیان ناوی برای ئیبراهیمی پێغەمبەر بوو (..) چونکە ئەو بنیادی ناوەو دواتر ناوەکە تەعریب کراوەو بووە بە حەڕڕان - (قرة العين - ل١٧).

---

[٦٠] بڕوانە ل(١٥)ی تەرتیبی لاپەڕەکانی (محقق)ی کتێبەکە.

[٦١] شوان بەردەوام دەنووسێت (نوسەیبین) کە ئەمە هەڵەیەو ڕاستەکەی نەسیبین(نەصيبين)ە، بڕوانە معجم البلدان، بەرگی٥، بابەتی نەسیبین، ل٢٨٨. سەیرە کە سەرپەرشتیاری شوان‌و سێ دکتۆرەکەی تر نەیانتوانی ئەو هەڵەیە بە شوان چاك بکەنەوە.

[٦٢] لێرەدا مەبەست موناقەشەی ئەوە نییە نوێنەری مەسیح هاتبێ یان نا بەڵکو مەبەست ئەوەیە کاك شوان سەرچاوەکەی بەڕاستی دیوە یان نا.جارێکی تر دەڵێم لەم بەشەدا کەم جار نەبێت موناقەشەی زانیارییەکان ناکەین.

هەموو باسی حەڕڕان لەو کتێبەدا سێ دێرو نیوە.خاوەنی (قرة العين)یش باسی ئەوە دەکات کە لە حەڕڕاندا نوێژگایەکی صابیئییەکان هەیە کە دەیگەڕێننەوە بۆ ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت)، ئیتر هیچ لەم باسانەو لە تەعریبی ناوەکە نەوتراوە. حەڕڕان ناوێکی زۆر کۆنەو کاک شوان لە گیرفانی خۆی ناوی بەهارانی دەرهێناوە. ناوەکە چوار هەزارە کۆنەو لە سەرچاوە مێخییەکاندا بە شێوەی خەررانوم، دواتر خەررانو (ڕەنگە هەر حەررانو بێت) هاتووەو چەند واتایەکی بە ئەکەدی هەیە کە یەکێکیان (ڕێگە)ـەیە.

٤ـ ل٢٥ شوان: هەر لەبارەی حەڕڕانەوە: ((دەکەوێتە سەر ڕێگای موصلّو شامو ڕۆم)) – قرة العين ل١٧. یەك وشە لەم بارەیەوە نییە.

٥ ـ ل٢٩ شوان: میافارقين((دانیشتوانەکەی تێکەڵاون لەموسڵمانو مەسیحی)) ـ قرة العين ل١٩.بەڵام خاوەنی کتێبەکە ئەمە دەڵێت:((خەڵکەکەی موسڵمانی تورکنو نەصرانیی ئەرمەنن)).

## حەوت – کتێبی (الاثار الباقية عن القرون الخالية)ی (البيروني)

کاك شوان (ل٢٧٣-٢٧٤) باس لەباجی (نەورۆزانە)و (میهرەگانانە) دەکات کە خەڵکەکە دەیاندان بەپادشا ساسانییەکانو لەسەردەمی خەلیفەی ئومەوی (موعاویە) زیندووکرانەوە، پاشان دەڵێت موعاویە داوای لەخەڵکی ڕەشەخاك (ارض السواد)ی کرد نەورۆزانە بدەنو بەمە توانی بڕی دە هەزار دینار کۆبکاتەوە – البيروني، ل٣١، ٣٤.

بەڵام بابزانین بەیروونیخۆی چی دەڵێت: بەیروونی (ل٣١ بەدواوە) باسی مێژوو دانانو کاتی وەرزەکانو کاتی کشتوکاڵ.. تاد لای ساسانییەکان دەکات، مەسەلەکەش لەوەوە هاتووە کەخەلیفەی عەبباسی (المتوكل) بینی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان هێشتا سەوزن بەڵام خەراجی زەوی لەوکاتەدا دەدرێت. ئەوانەی لەگەڵیدابوون بۆیان ڕوون کردەوە کە ئەمە لەکاتی پادشایانی فارسەوە هەبووە. ئیتر هیچ لەو باسە دوورودرێژەی بەیروونی لەبارەی مێژوودانان پەیوەندیی بەباجی نەورۆزانەو میهرەگانانە نییەو هیچی تێدا نییە لەبارەی موعاویەو وەرگرتنی دە هەزار دیناری نەورۆزانە ئەمەش بەسە بۆ سەلماندنی ئەوەی شوان چاوی بەو کتێبە نەکەوتووە[٦٣].

سەبارەت بەو دە هەزار دینارەی موعاویە کۆی کردوونەتەوە لەکتێبەکەی دکتۆر (توفيق اليوزبكي): دراسات في النظم العربية الاسلامية، باس لە دە هەزار درهەم کراوە نەك دینار (دینار لە کاتی عومەر ١٢ درەهەم بوو، بڕوانە اليوزبكي ل١٢٦ ئەویش لەمیانەی قسەی تر).

باسەکەی بەیروونی ئەوە بوو کەبینیمان کەچی دەبینین کاك شوان لەلاپەڕە (٩٦)دا دەڵێت ((چەندین جەژنی تایبەت بە کشتوکاڵ لەئاینی زەردەشتیدا هەبوو))و ئاماژە بۆ لاپەڕە (٢٤١)ی کتێبی بەیروونی دەکات کە ئەویش هەروەکو باسەکەی تر لەبارەی مێژوودانانو کاتی وەرزەکانە..و هەمان شت هی سەردەمی عەبباسییە.

## هەشت – کتێبی (المشترك وضعاً والمفترق صقعاً)ی ياقوت الحموي.

ل٤٢ شوان: باس لەپردەکەی زاخۆ (الحسنية) دەکات: ((کورد پێی دەڵێن پردی دەلال یان پردی مەزن)) – المشترك وضعا، ل١٥٠ (بەتەنیا).

تەماشای کتێبەکە بکە دەبینی یەك وشەی لەبارەی پردەکە تێدا نییەو تەماشای پێڕستی ناوەکانیش بکە ناوی (الحسنية) نابینی. ئەو لاپەڕەیەش تەنها باسی ڕووباری خابوور دەکات.

ئینجا خوێنەر هەقیەتی دوای ئەمە بەوە پێبکەنێت کە گوایە یاقووتی حەمەوی نووسیویەتی ((کورد پێی دەڵێن پردی دەلال یان پردی مەزن))!! قسەکەش خراوەتە نێوان جووتەکەوانە کە نیشانەی وەرگرتنی دەقاودەقە. تێبینی ئەوەش بکە کتێبەکە بەتەنیا وەرگیراوە واتا لەپەراوێزەکەدا تەنها ناوی ئەو کتێبە وەك سەرچاوە نووسراوە.ئەوەی بینیومە شوان تەنها

[٦٣] شوان دوو سەرچاوەی بۆ ئەمە نووسیوە، دووەمیان (كتاب الخراج)ی (ابو يوسف)ە، لەچاپێکی تری کتێبەکەی (ابو يوسف) فەرمانێکی (عومەر کوڕی عبدالعزيز)م بینی کەتیایدا دەڵێت دیاریی نەورۆزو میهرەجان وەرمەگرە (ل٩٣).

ئەم جارە ناوی ئەم سەرچاوەیەی نووسیوە کەگوایە بەکاری هێناوەو دەرکەوت چاوی پێنەکەوتووە. تەعبیرەکەش روون و ئاشکرا دەریدەخات کە شوان لە کتێبێك کوردیی بردووەو ئەو کتێبە بە پەندی داوە.

**نۆ- کتێبی (الجبال والامکنة والمیاه) ی (زەمەخشەری).**

ل٣٢ شوان: باسی چیای جودی هاتووە کە دەکەوێتە سەرووی شاری موصلّ – الجبال والامکنة والمیاه ج٣/٥٨ (بە تەنیا).

ئەوەی لەکتێبەکەی شواندا دیومە ئەوەیە شوان یەك جار کتێبەکەی زەمەخشەریی وەکو سەرچاوە نووسیوە. کتێبەکە تەنها یەك بەشە کەچی شوان دەڵێت (ج٣)! دواتر زەمەخشەری لەبارەی جوودییەوە دەڵێت کێوێکە لەلای مووصلّ نەك (سەرووی مووسلّ)، ئینجا لاپەڕەی (٥٧)ی کتێبەکەیە نەك (٥٨).

**دە- (اخبار النساء)ی (ابن قیم الجوزیة)**

ل٢٩١ شوان: کاك شوان باس لەوە دەکات چۆن عەرەبە موسڵمانەکان بۆیان هەبوو چەند ژنێکی موسڵمانی ناعەرەب بەناوو شێوازی جیا جیاوە بهێنن یان زەوتیان بکەن – اخبار النساء ل١٣-٢٠ (بەتەنیا).

سەرەتا بەپێی جۆری باسەکانی ئەم کتێبە گومانم هەیە (ابن القیم) نووسیبێتی هەرچەندە ناوی ئەوی لەسەر نووسراوە، بەڵام بەهەرحاڵ ئەمە دوورە لەمەبەستی ئەم بابەتەمان..

ئەو لاپەڕانەی کاك شوان باسیان دەکات (واتە ل١٣-٢٠) لەچاپی تردا (ل١٢- ٢٠)ن و ئەمە چیرۆکێکی دووروودرێژە لەبارەی (مەڕوان کوڕی ئەلحەکەم) کە ژنی ئەعرابییەکی زەوت کردبووو بەزۆر پێی تەڵاق داو ئەمیان پەنای بردە بەر (موعاویە)، کەواتە: یەکەم: ئەمە ڕووداوێکی تاکە، دووەم: ئەمە چیرۆکە نەك حوکمێکی گشتی، سێیەم: باس لەئافرەتی ناعەرەب ناکات چونکە ژنەکە ئامۆزای ئەعرابییەکەیە.

کاك شوان جارێکی‌ترو لەهەمان لاپەڕەدا پەنا دەباتە بەر شتێك کەمترین وەسفی شیاوی ئەوەیە بوهتانە کە دەڵێت: ((واتە پێگەو پایەی ژن هەروەك سەردەمی بەر لەئیسلامی لێهاتەوە چونکە دەتوانرا ئەو ژنانە بکڕن و بفرۆشن و تەنانەت پێشکەش یەکتریشی بکەن)و شوان ناوی (اخبار النساء،ل١٠٤-١٠٥) دەهێنێت کە ڕاستییەکەی ئەوەیە باسی جارییەیەکی (سولەیمان کوڕی عبدالملك)ـەو باسی غیرەتی سولەیمان سەبارەت بەو جارییەیە.شوان بۆ قسەکەی سەرەوەی هەروەها ناوی کتێبی (تاریخ الخلفاء)ی (السیوطی) دەهێنێت کەدواتر دەچینە سەری.

**یانزە – گەشتەکەی (ابن بطوطة)**

ئەوەی دیومە کاك شوان یەك جار ئەم سەرچاوەیەی نووسیوە. کاك شوان باسی شاری تەبریز (تەورێز) دەکات (ل٨٠)و دەڵێت ((بەڵام دواتر تەورێز گەشەی کردووەو تەنانەت هەندێ لەگەڕیدە موسڵمانەکان بەناودارترین شاری ئازەربیجانی لەقەڵەم دەدەن)) – ابن بطوطة ج٢/ل١٢٩.

لەو چاپەی لەبەردەستمدایەو لەپێرستی ناوەکاندا سێ جار ناوی تەورێز هاتووەو تەنها لەیەکێکیاندا گەڕیدەکە باسی چوونی ناو شارەکە دەکات و وەسفی شارەکەو بازاڕە گەورەکانی دەکات ئیتر ناڵێت ناودارترین شاری ئازەربایجانە.

**دوانزە – (تاریخ غرر السیر)ی (الثعالبی)**

١-ل٩٥ شوان: ((واتە ئاینی زەردەشتی بڕوای بەزیندووبوونەوەو ڕۆژی حیساب هەبووە)) – الثعالبی ل٢٥٨.

شتی وا لەوێدا نەوتراوە. ((جارێکی تر تێبینی بکە ئێمە موناقەشەی خودی زانیارییەکان ناکەین بەڵکو ڕەفتاری نازانستیی و دوور لە ئەمانەتی کاك شوان)).

٢-ل٩٦ شوان: باس لە ململانەی نێوان هێزی چاکە (ئەهورامەزدا)و هێزی خراپە (ئەهریمەن) کە ((چوار قۆناغ دەخایەنێ کە دەرئەنجام بە سەرکەوتنی هێزی چاکە (ئاهورامزدا) کۆتایی دێت)) – الثعالبی ل٢٥٨- ٢٦٠.

یەك وشە لەمانە نییە لەو لاپەڕانە. لەلاپەڕە (٢٦١)ی کتێبەکەی (الثعالبی)دا باس لەو باوەڕە دەکات کەخوداوەند فیکرەیەکی خراپی کردو لەمەوە ئەهریمەنی خراپەکاری لێدەرچوو. ئیتر نەچوار قۆناغ و نەهیچ.

٣-ل٩٦ شوان: شوان دەڵێت کە لە ئاینی زەردەشتی چوار توخمی پیرۆز هەیە – هەوا، ئاو، ئاگر، خۆڵ کە نابێت پیس بکرێن (الثعالبی ل٢٥٨).

ئەو لاپەڕەیە هیچی وای تێدا نییە. تەنها باسی ئاگر کراوە کەبەپیرۆز زانراوە باسی ئاویش لەلاپەڕە (٢٥٩)دا هاتووە (تێبینیی ئەوە بکە هەمان چاپمان بەکارهێناوە).

**سیانزە – (الجزیرة الفراتیة والموصل)ی (محمد جاسم حُمادی)**

١-ل٣٤ شوان: باس لە (جزیرة ابن عمر) ـەد: ((بەرلەوەی ئاوەدان بکرێتەوە لەسەر دەستی حەسەنی کوڕی عومەری تەغلبی..) – الجزیرة الفراتیة، ل٢٣٠-٢٣١.

باسی ئەوەی تێدا نییە بەڵکو باسی عیراقە.

٢-ل٣٧ شوان پەراوێز: لەبارەی ناونانی مووصڵەوە کە لەوەوە هاتووە دیجلەو فورات بەیەکەوە دەبەستێت.

ئەمە لەلاپەڕە٩٧ی کتێبی(الجزیرة الفراتیة)دا هەیە کە ئەمە رایەکە لەناو چەندین ڕا (ل٩٧-٩٨ باسکراون). شوان لەپەراوێزدا دەڵێت ((ئەم بەیەکەوەبەستنە مەبەست هەر لایەنی جوگرافی نییە، بەڵکو لایەنی ئابووریو سیاسی لەخۆ دەگرێت))-الجزیرة الفراتیة والموصل، ل٩٦.

بەڵام کتێبەکە هیچی وای تێدا نییە.

٣-ل٢٦٠ شوان: ((هەروەها سیاسەتی بەعەرەبەکردنی شاری جەزیرەی بۆتان (جزیرة ابن عمر)یشی گرتەوەو هۆزەکانی (بنو ربیعة وبنو عجیل)ی هۆزی (ال بشار)ی تیادا نیشتەجێ کران ژمارەیەکیشیان لەچیای جودی (جبل جودی) نیشتەجێ ببوون)). – حُمادی ل١٦١.

بەڵام نووسەر باسی سنجار دەکات کە (آل بشار) ی تێدایە وکە ولاتیان (=دیارُهُم) جەزیرەیە پاشان دەڵێت کە لەگەڵ (بنو ربیعة)و (بنو عجیل) دراوسێنو ولاتیان لە (سنجار)دایە .. تاد (ل١٦١-١٦٢)

تێبینی: لای حُمادی (فیسکنها ال بشار ودیارهم الجزیرة وهم بنو ربیعة وبنو عجیل جیران..) کەواتای نییەو پێویستە وابێ: (فیسکنها ال بشار ودیارهم الجزیرة وهم وبنو ربیعة وبنو عجیل جیران) واتە پێویستە پێش (بنو ربیعة) ئامرازی (و) هەبێ.ناوبراو قەلقەشەندی بەرگی/١ ل٢٤٣-٢٤٥ی وەك سەرچاوە نووسیوە بەڵام ئەوەم لەو سەرچاوەیەدا نەبینی (شوانییات؟).

٤-ل٢٦٠شوان: هەروەها بەعەرەبکردن گەیشتە نێوان زێی بچووكو زێی گەورە، هەولێرو دەوروبەری هۆزی (بنو شیبان)ی تیادا نیشتەجێ بوونو دەشتە بەپیتەکانیان بۆ لەوەڕگا بەکاردەهێنا -الجزیرة الفراتیة، ل١٦٦.

نووسەر دەڵێت: هۆزی عەنزە(عنزة) یەکێك بوو لەو هۆزانە کە لەزەوییەکانی ڕۆژهەڵاتی مووصڵ نزیك هەولێر لە(حەززە)دا نیشتەجێ بوونو کە پەیمانیان لەگەڵ هۆزی (شەیبان)دا هەبووە.

**چواردە – (بلدان الخلافة الشرقیة)ی (گی لو سترانج) Guy Le Strange**

١-ل٢٦شوان: لەبارەی شاری حسنکیف (حصن کیفا): ((دەکەوێتە نێوان دیجلەو میافارقینو جەزیرەی ئیبن عومەرەوە)) – لو سترانج، ل١٤٤.

بەڵام لوسترانج باس لە (حصن کیفا) دەکات کە لەسەر قەراغی باشووری ڕوباری فوراتدایە لەنێوان شوێنی ڕژانی ئەو دوو ڕووبارەی لە باکووری میافارقینو (ئەرزن)ەوە دێن لەناویدا.

٢-ل٢٧ شوان: ((هەندێ لە مێژوونووسو گەڕیدە موسڵمانەکان دەربارەی ئامەد دەڵێن دەکەوێتە کەناری خۆرهەڵاتی ڕووباری دیجلە)).

کاك شوان ناوی سێ سەرچاوە دەبات ، ئەوەی لو سترانج (ل١٤٠) یەکێکانە. بەڵام ناوبراو پێچەوانەی ئەمە دەڵێت: ڕۆژئاوای دیجلە واتە لای دەستی ڕاستی .. ئەمەشیان قسەی خۆیەتی نەك هی مێژوونووسو گەڕیدەی موسڵمان.

٣-ل٨٠ شوان: ئەم ناوە دەهێنێت: نقجوان (نەقشەوان) "نشوی" ئەویش لەگەڵ تەورێزو دەڵێت نزیکەی ٣٦ کیلۆمەتر لەیەکتری دوورن –لوسترانج ل١١٤. لوسترانج ل(٢٠١) باس لە نەخچەوان دەکات.. لەکاتێکدا ئەو لاپەڕە (١١٤)

یەی شوان دەینووسێت نەخشەیەکی لە بەرامبەردا هەیە. پاشان بەپێی ئەو نەخشەیە نێوان نەخچەوان‌و تەبرێز نزیکی ٢٠٠ کیلۆمەترە!!

**پانزە – (تقويم البلدان)ی (ابو الفداء):**

لە بەشەکەی تردا شت دەبینین لەبارەی تەقویمەوەو ئێستا ئەمەیان بەسە:

ل٥٧–٥٨ شوان: شوان باسی شاری (بروجرد) دەکات کە ٣٠ میل لەکەرەج دوورە – تقويم البلدان، ل٤١٩.

بەڵام نووسەر باسی دووری ناکات بەڵکو دەڵێت: ((میوەکانی دەبرێن بۆ کەرەج)) !!

**شانزە – مێژووەکەی (ابن خلدون):**

لەبەشی دووەمدا ئەمە لەگەڵ سەرچاوەی تردا دەبینینەوە. ئێستا با هەر خۆی بگرین.

١–ل١٨١ شوان: کاک شوان لەبارەی هورموزانەوەو رێککەوتنەکەی لەگەڵ موسڵماناندا توانج دەگرێتە ئەو موسڵمانانەو دەڵێت: وا دەردەکەوێت بەرژەوەندییە ئابوورییەکان لەسەرووی مەبەستەکانی تر بووە – ئیبنو خەلدوون، مج ٢، ج ٢، ل١١٢.

کەچی ناوبراو هیچ شتێکی وا نالێت.

٢–ل٢٤٨ شوان: شوان باس لەئازەربایجان‌و لەپەلاماردانی سالآنەی ئۆردووی کووفە دەکات کە هەر جارەی دە هەزار جەنگاوەر بەشدارییان تیادا کردووە– ئیبنو خەلدوون، مج٢/ج١/ ل١٢٧–١٢٨.

ئیبنوخەلدون هیچی لەم بارەیەوە نەوتووە. شوان هەڵەشی لەژمارەی بەشی بەرگەکە کردوە کە بەشی دووەمە نەك یەکەم‌و شتێکی خۆش لەم بارەیەوە هەیە (بڕوانە خوارتر).

٣–ل١٨٣ شوان: شوان دەڵێت هورموزان لە (رامهرمز)ەوە داوای رێکەوتن‌و ئاشتیی لە (حرقوص)و (جزء بن معاوية) کردەوە–ئیبنوخەلدوون ،مج٢/ج٢/ ل١١٢ .

ئیبنو خەلدوون تەنها ئەوە دەڵێت کە هورموزان داوای صوڵحی کرد کە باقی ئەو وڵاتەی لەژێر دەستیدا بوو بمێنێتەوە ژێر دەستی.

٤–ل١٨٢ –١٨٣ شوان: (جزء بن معاوية) شاری (دورق)ی گرت‌و خەلیفە عومەرو (عتبة بن غزوان)ی لە سەرکەوتنەکانی ئاگادار کردەوە –ئیبنو خەلدوون مج٢/ج٢/ ل١١٢ (بەتەنیا).

ئیبنو خەلدوون دوای باسی گرتنی (دەورەق) دەڵێت خەڵکی فارس کۆبوونەوەو هەواڵ گەیشتە (حُرْقوص)و (جُزء)و (سُلْمی)و (حَرْمَلة) ئەوانیش نامەیان بۆ عومەر نارد. ئیتر نە (جزء) بەتەنیا شتی نووسی‌و نە نامەکە لەبارەی سەرکەوتنەکان بووو نە (جزء) نامەی بۆ (عتبة) ناردووە. بڕوانە لێرەدا ئیبنو خەلدوون بەتەنیاو بیٚ سەرچاوەی تر بەکارهاتووە.

نموونەی تری بەکارهێنانی هەڵەی کتێبەکەی ئیبنوخەلدوون: لاپەرە (١٨٠) پەراوێزی (٢)، لاپەرە (١٨١) پەراوێز ١.

یەکێکیش لە شتە خۆشەکان ئەوەیە بەرگی دووەمی ئەو چاپەی کتێبەکەی ئیبنو خەلدوون[٦٤] دوو بەشی تێدایە بەڵام لە کاتی کۆکردنەوەی پەرەکان‌و لەبەر لێکچوونی قەبارەو رەنگ‌و چاپی پەرەکان‌و ژمارەی سەر لاپەرەکان ژمارەیەك لە لاپەرەکانی بەشی یەکەم چوونەتە بەشی دووەم بەهەمان تەرتیب، بەپێچەوانەشەوە ئەوانەی بەشی دووەم خراونەتە بەشی یەکەم ، خوێنەریش بە چاو هەست بەوە ناکات تا باسەکان نەخوێنێتەوەو نەبینێت لەپڕ باسەکان لەو لاپەرانەدا دەگۆڕێن بەڵام کاک شوان هەستی بەوە نەکردووە. بۆ نموونە باسی (ایذج) لەئەسڵدا لەبەشی دووەمی بەرگی دووەمە بەڵام چونکە ئەو پەرانە پەڕیونەتە بەشی یەکەم کاک شوان لەجیاتی ئەوەی هەست بەوە بکات‌و گویٚ نەداتە هەڵەی چاپ‌و پەراوێزەکە وا

[٦٤] چاپی ١٩٧٩ کە لە کتێبخانەی کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سلێمانی وەرمگرتبووو دیارە شوان لە هەمان شوێنەوە وەریگرتووە –رەنگە هەرچی نوسخەی تر وایان لیٚ هاتبیٚ.

بنووسێت: تاريخ ابن خلدون، مج٢/ج٢/٧١٣١ دەبینین پەراوێزەکە بەم شێوەیە دەنووسێت: تاريخ ابن خلدون، مج٢/ج١/١٣١٧!

ئەمەی لە لاپەڕە (١٣٤) پەراوێزی (٧) کردووەو جارێکی تر لەلاپەڕە (٢٤٣) پەراوێزی (١)، جارێکی سێیەمیش لە لاپەڕە (٢٤٨) پەراوێزی (٣) هەمان هەڵە دەکات.

## حەڤدە – (فتوح البلدان)ی (البلاذری):

شت زۆرە لەسەر ئەم کتێبە.هەندێکیان لەبەشی داهاتوودا دەبینین.لێرەدا ئەمانە بەسن.

١–ل١٨١ شوان: شوان دەڵێت هورموزان ((پەنای بردە بەر کوردەکان و لەشکرێکی زۆری لێکوبۆوە، ئەمەش عەرەبە موسڵمانەکانی خستە مەترسییەوە، چونکە کوردەکان بەئازایەتی و لەخۆبووردەیی لەشەڕدا ناسرابوون)).

کتێبی فتوح البلدان(ل٣٧٥) یەکێکە لە سەرچاوەکان کەچی ئەو لاپەڕەیە نەباسی هورموزانی تێدایەو نە وەسفی کوردی تێدا کراوەو باس کورد لێرەدا ئەوەیە کە ئەمان لە خەڵکی (سنبيل)و (الزط) کۆبوونەوە.

٢–ل٢٦٢ شوان: شوان دەڵێت: تەنانەت کێشە لەسەر داهاتی نەهاوەندو دینەوەر کەوتە نێوان هەردوو ئۆردووی سەربازی کووفەو بەسرەی عەرەبە موسڵمانەکان بەڵام دواتر موعاویە داهاتەکەی بەسەر هەردوو لا دابەش کرد چونکە خەراجەکەی زۆر بوو – فتوح البلدان ، ل٣٠٢ (بەتەنیا).

بەڵام ناوبراو باسی کێشەی نێوان دوو ئۆردووەکە ناکات و ئەسڵەن باس لە ئۆردوو ناکات بەڵکو باسی خەڵکی دوو شارەکە دەکات ئەویش کە خەڵکی کووفە زیادیان کردو پێویستیان بە خەراجێکی زیاتربوو ، ئەوەبوو دینەوەرو نەهاوەند ئاڵوگۆڕیان پێکرا، ئەمەش لەکاتی موعاویەدا بوو. ئیتر نەباسی ئەوە کراوە داهاتی دوو شارەکە زۆر بووەو نە موعاویەش خەراجی دوو شارەکەی بەسەریاندا دابەش کرد.

٣–ل٢٩٠ شوان: شوان دەڵێت: ((عەرەب ببوون بە چینی دەسەڵاتداری ئۆروستوکراتی کۆمەڵگای دەوڵەتی خیلافەت، لەبەرامبەردا موسلمانی ناعەرەب لەڕووی ئابوورییەوە لەوپەڕی خراپیدا دەژیان)) – فتوح البلدان، ل٢٧٩.

ئەمەش بوهتانێکی گەورەیە چونکە هیچی وا لەم لاپەڕەیەدا نییە (تەنانەت سەیری ئەم لاپەڕانەش بکە نەوەکو هەڵەی چاپ بێت: ٢٨٩، ٢٩٧، ٣٧٩، ٣٨٩ دەبینی دیسان ئەوەیان تێدا نییە). بەپێچەوانەی ئەوەش کە شوان دەیڵێت لەو لاپەڕەیەی شوان نووسیویەتی (ل٢٧٩) باسی چوار هەزار سەربازی دەیلەمیی ناو لەشکری روستەم کراوە کە لە شەڕی قادسییە لەگەڵ روستەمدا بوون. ئەمانە پاش شکستی لەشکری ساسانی داوای ئەمانیان کردو بەو مەرجە بوونەموسڵمان کە لەو شوێنەدا نیشتەجێ بن کە حەزیان لێیەو حەلیفی ئەو عەشیرەتە عەرەبە بن کە خۆیان پێیان خۆشەو (عەطاء)ی پێ بدرێت. موسڵمانانیش ئەمانەیان بۆ جێبەجێ کردن. ئەمانە بوونە موسڵمان و بەشدارییی گرتنی مەدائین و شەڕی جەلەولایان کردو پاشان لە کووفە نیشتەجێ بوون.

٤–ل٢٩٠ شوان: ناعەرەبەکان بە وتەی شوان: لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە دەبوایە نیشانەی دیاریکراو بە سنگییانەوە بێت تاوەکو بناسرێنەوە – فتوح البلدان ل٣٦٨. ئەمەش بوهتانێکی ترەو ئەو لاپەڕەیە هیچی وای تێدا نییە.هەر بۆ دڵنیایی و نەوەکو هەڵەی چاپ بێت تەماشای ئەم لاپەڕانەم کرد ٢٦٨، ٢٨٦، ٣٨٦و شتی وا نەبوو.

## هەژدە – مێژووەکەی (تەبەری):

لەبەشی داهاتوودا ژمارەیەك نموونەی مێژووەکەی (تەبەری) لەگەڵ سەرچاوەی تر دەبینینەوە. لێرەدا ئەم دوو نموونەیەمان هەیە.

١–ل٢٤٤ شوان: شوان قسەیەکی دووروردێژ دەکات لەبارەی گوایە جاری دووەمی ڕاپەڕینی شاری (ماسبه ذان)و دەڵێت شارەکە ڕاپەڕی و خەڵکەکەی توانییان ناوچەی (صیمرەو ماسبدان) ڕزگار بکەن بەڵام خەلیفە عومەر (سَلَمة بن قيس الاشجعي)ی بەهێزێکەوە ناردە سەریان و دوای شەڕو کوشتار توانی ناوچەکە داگیر بکاتەوە – تەبەری ج٥/ل٥٠–٥١.

بەڵام هیچ لەبارەی ڕزگارکردنی صەیمەرەو (ماسبه ذان) نییە بەڵکو تەنها باسی شەڕەکەی سەلەمە کراوە.

٢-ل٢٤٤ شوان: دوایی باسی گوایە جاری سێیەمی هەڵگەڕانەوەی (ماسبە ذان) دەکات - تەبەری ج٥/ل٧-٨ لەکاتێکدا تەبەری باس لەماسبەدان ناکات بەڵکو لەنەهاوەند. بڕوانە کەچۆن لای شوان هەڵگەڕانەوەی دووەمی ماسبەدان لەلاپەڕە (٥٠-٥١)ی تەبەریدا هاتووە کەچی هەڵگەڕانەوە سێیەم لەلاپەڕە (٧-٨)دا تەبەریدا نووسراوە واتە تەبەری سەرەتا باسی هەڵگەڕانەوەی سێیەم دەکاتو پاش (٤٣) لاپەڕە باس لەهەڵگەڕانەوەی دووەم دەکات!!

**نۆزدە - سیاحەتنامەی (ئەولیا چەلەبی):**

کاك شوان تەنانەت لە کتێبی کوردیش باش تێنەگەشتووەو زانیارییەکانی بە دروستی نەقڵ نەکردووە، لە خوارتریشدا چەند کتێبێکی تری کوردی دەبینینەوە:

١-ل٣١ شوان: کاك شوان باسی شاری مەلاتیە دەکاتو دەڵێت خەڵکەکەی کوردو تورکومانن بەڵام زمانە تورکمانییەکەیان جۆرێکە تورکەکان باش لێیان حاڵی نابن، ڕەنگە ئەمەش کاریگەری زمانی کوردی بێت لەسەریانو زۆربەشیان موسڵمانن -سیاحەتنامە، ل١٦-١٧، ل٢٥.

بەپێی ئەو پەراوێزەش کە شوان دایناوە خوێنەر وا دەزانێت قسەی ((ڕەنگە ئەمەش کاریگەری زمانی کوردی بێت لەسەریان)) قسەی ئەولیا چەلەبییە بەڵام ڕاستەکەی ئەوەیە قسەی شوان خۆیەتی. قسەکەی شوانیش کەوتۆتە نیوان دوو قسەی ئەولیاو شوان بۆ هەموویان یەك پەراوێزی داناوە. جگە لەمە ئەولیا دەڵێت هەموویان موسڵمانن (ل٢٥) نەك زۆربەیان.

٢-ل٢٨ شوان: شوان لەزاری ئەولیا باسی (ئامەد) دەکات کە مێژوونووسانی عەجەم دەڵێن: لەبەر ئەوەی کچێك حوکمی کردووە.. تاد (ل٣٢- بەتەنیا) کەچیئەولیا خۆی دەڵێت بنیاتنەری کچ بووە (نەك کچ حوکمی کردووە).

**بیست: (التاریخ الاسلامی)ی (محمود شاکر)**

کاك شوان بێ ئەوەی ناوی کتێبەکە لەلیستی سەرچاوەکاندا بنووسێت ئەم کتێبە زۆر بەکاردەهێنێت. لێرەدا ئەم چەند هەڵەیەم هەڵبژارد.

١-ل١٦٨ شوان: شوان دەڵێت (نعمان بن مقرن المزنی) نامەیەك بۆ خەلیفە عومەر نارد کە لەجیاتی ئیشی باجگری بینێرێت بۆ ئۆردوویەکی موسڵمانان تا تیایدا درێژە بە جیهاد بداتو خۆی کارەکەی ئێستای بە پیاوێکی پیرو سۆزانییەك دەشوبهێنێت.. تاد- التاریخ الاسلامی مج٢/ج١/ل١٨٣-١٨٤. هەرچەندە باسی نامەیەکی وای (النُعْمان کوڕی مُقرِّن) لەسەرچاوەی تردا هەیە بەڵام ئەو کتێبە یەك وشەی لە قسەکەی شوانی تێدا نییە مەگەر ناوی عومەرو النُعْمان. لەم کتێبەدا نامەی عومەر بۆ النُعْمان و کەسانی تر باسکراوەو کە تێیدا فەرمان دەدات هەر یەك بە لەشکرەکەی خۆیەوە دەربچێتو کە بەیەك گەشتن النُعْمان دەبێتە سەرکردەیان.

٢-ل١٨٦ شوان: شوان باس لە هورموزان دەکات کە بەرگرییەکەی ((توندتر دەکراو دانیشتوانیش هاوکارییان دەکرد)) - التاریخ الاسلامی مج٢/ج١/ل١٨١.

لەچاپەکەی لای خۆشم ل١٧٦: هیچ شتی وای تێدا نییەو هەرئەوەندە (ابو سبرة) ژمارەیەك جەنگاوەری زۆری لەگەڵ هورموزاندا بینی.

٣-ل٢١٣ شوان: مەحموود شاکر باسی ژیریی عومەر کوڕی خەتتاب دەکات کە دەترسا کۆمەڵگەی ئیسلامی پیس بێت (ل١٨٥ چاپی لای خۆم) کەچی کاك شوان باسی لەشکرەکانی عومەر دەکاتو دەڵێت ((خەلیفە عومەریش زۆر لەوە زیرەکترو بەئاگاتر بوو کە لەشکرەکەی بخاتە مەترسییەوە)) . التاریخ الاسلامي مج٢/ج١/ل١٩١-١٩٢.

٤-ل٢١٧ شوان: ((بۆچوونێکی تر دەڵێ حەڕڕانیەکان بەر لەگەیشتنی لەشکری عیاض بۆ شارەکەیان، چۆڵیان کردبوو، چووبوون بۆ شاری ئۆرفە)) - التاریخ الاسلامی مج٢/ج١/ل١٦٤.

لەچاپی لای خۆم ل١٥٩: تەنها باسی سوڵحی عیاض لەگەڵ خەڵکی حەڕڕانو ئەلرەها (ئۆرفە)و ئەلڕڕەقەو ئەو شتەی کاك شوان نەنووسراوە. قسەکە لە سەرچاوەی دووەمی شواندا (فتوح البلدان، ل١٧٩) هەیە.

**بیستو یەك: (احسن التقاسیم)ی (المقدسی البشّاري):**

**١–ل١٩ پەراوێزی ١٠ شوان: ((وە ئوستانیش دابەش دەبێت بەسەر چەند ڕستاقێكو ڕستاقیش دابەش دەبێت بەسەر چەند تسوجێك (طسوجة)و تسوجیش دابەش دەبێت بەسەر چەند گوندێك)) – احسن التقاسیم، ل٤٧ (بە تەنیا)[٦٥].**

**(المقدسی) دەڵێت: هەر ئیقلیمێك دەبێت (ژمارەیەك) كوورەی هەبێتو هەر كوورەیەك قەصەبەیەكی هەبێت پاشان هەر قەصەبەیەك (ژمارەیەك) شاری هەبێت..**

**شوان دەزانێت (كوورە) (ئوستان)ـە، بەو پێیە ئەوەی ئەو لە زاری المقدسی وتوویەتی جیاوازە لە دەقی قسەكە.**

**٢–ل٢٥ شوان: لەبارەی ئۆرفە (الرها)وە: ((و سەرەڕای باغو بێستانێكی زۆرو لەئاوەدانیدا ئەوە كەنیسەی ئەم شارە لەوڵاتی ئیسلام هاوتای نەبووە)) – احسن التقاسیم، ل١٤٢.**

**ئەمە لەكاتێكدا كتێبەكە باسی ئەو هەرێمە دەكات كە ئۆرفە تێدایەو دەڵێت دارەخورمای تێدایەو هیچ باس لە باخ و بێستانی زۆرو باسیش لەكەنیسەی ئۆرفە ناكاتو تەنها ناوی ئەلڕەها هاتووە كەئەسڵی صابیئییەكان لەوێو لە حەڕڕاندایە.**

**٣–ل٣٩ شوان: خاوەنی (أحسن التقاسیم) –ل٤٧ باس لە دابەشكردنی وڵات بۆ هەرێمو كوورەو .. تاد (هەمان خاڵی یەكەمی سەرەوە) كەچی كاك شوان لەپەراوێزی لاپەڕە ٣٩ سێ دێڕ دەنووسێت كەدوو دێڕی لێكدانەوەی ناوی دەیلەمستانەو پاشان باس لەكوورە دەكاتو ئاماژە بۆ (احسن التقاسیم) دەكات. هەڵبەت خوێنەر وادەزانێت كە باسی دەیلەمستان لەو كتێبەدا هاتووە چونكە پاش ئەم قسانەو بەتەنیا ناوی دەبات.**

**٤–ل٦٠ شوان: كاك شوان باسی كرماشان دەكات كە ((پێگەیەكی ستراتیژی هەیە، وەك دەربەندێكە بۆ گەشتیاران و كاروانەكانی بازرگانیو ئەمە جگە لەزۆری سەرچاوەی ئاوو باغو بێستانو خاكەكەش بەپیتە)) –أحسن التقاسیم ل٣٩٣ ئەمە لەكاتێكدا نووسەر باسی شتیتر دەكاتو ئەوەی لەقسەكانی كاك شوان دەچێت تەنها قسەكەیەتی كەدەڵێت ((باخی تێدایە))!**

**بیستو دوو: وەكو نوكتەیەكی خۆشیش كتێبی (الفاروق عمر) هەیە.**

**سەرەتا باسی زانیارییەكەی كاك شوان بكەین. پێشتر لەخاڵی (٣)ی كتێبەكەی (محمود شاكر)دا باسی وەسفەكەمان بینی كە بۆ عومەر كوڕی خەتتاب لەلایەن شوانەوە كراوەو كە لەوە زیرەكتر بوو لەشكرەكەی بخاتە مەترسیی (لاپەڕە ٢١٣ شوان). بۆ هەمان زانیاری لاپەڕە ١٧– ٢٥ی كتێبی (الفاروق عمر) دەنووسێتو ناوی نووسەری كتێبەكەی وا نووسیوە: د. محمد حسنین هیكل (هەمان شتیش لە لیستی سەرچاوەكاندا دەنووسێت).**

**یەكەم شت: ئەمە زۆر سەیرو سەمەرەیە بۆ یەك دوو دێڕ وەك سەرچاوە لاپەڕە ١٧–٢٥(واتە هەشت لاپەڕە) بنووسرێت. پاشان كتێبەكە دوو بەشەو كاك شوان ژمارەی بەشەكە نانووسێت. بەڵام لەهەمووی خۆشتر ئەوەیە نووسەر (محمد حسین هیكل پاشا)یەو كاك شوان وای زانیوە (محمد حسنین هیكل)ی نووسەری ناوداری میسرییە!! ئەم دوو شتەش بەسن بۆ سەلماندنی ئەوەی كاك شوان كتێبەكەی نەدیوە. كاك شوان تەنانەت نەیتوانیوە ساڵی لەچاپدانی بنووسێت.**

**بیستو سێ: (تاریخ الخلفاء)ی (السیوطی):**

**١–كاك شوان (ل٢٣٣) باسی مووسڵ دەكات: ((وە جارێك لەسەر دەستی لەشكری شام گیراوە ساڵی ١٨ ك)). شوان ناوی كتێبی (تاریخ الخلفاء، ل١٣٢) لەنێوان ژمارەیەك سەرچاوەی تر دەبات. ئەمەش دوای باسی ئەوەی گوایە جارێك لەسەر دەستی لەشكری عیراق ساڵی ١٦ی كۆچی گیرا بوو.**

---

[٦٥] ئەوە دەخەمەوە یادی خوێنەر كەتەعبیری (بەتەنیا) كەبەكاری دەهێنم واتای ئەوەیە شوان بۆ ئەو زانیارییە تەنها ئەو سەرچاوەیەی نووسیوە لەكاتێكدا ئەو زانیارییەی تەعبیری (بەتەنیا) یان لەگەڵدا نەنووسراوە واتای ئەوەیە سەرچاوەی تریش نووسراون جگە لەم سەرچاوەیە.

بەڵام سیووطی بەم جۆرە باسی گرتنی مووصڵ ناکات بەڵکو تەنها لەرووداوەکانی ساڵی ١٨ دەدوێت وەدەڵێت مووسڵو دەوروبەری بەشەڕ گیرا، ئیتر نەباسی ئەوەی کردووە ئەمە جارێکی تر بووەو نەباسی لەشکری شامی کردووە.

٢–ل٢٧٧ شوان: شوان باسی داهاتی زۆری کوردستان دەکاتو دەڵێت: ((بۆشمان دەردەکەوێت کەباپیرانمان چەند ماندوو بوونو بەری ڕەنجیشیان چۆن دیمەشق یان بەغدا لێکێشراوەتەوەو خەزێنەکانی خەلیفەیان لێپڕکردنو بۆ خۆشگوزەرانیو ڕابواردنو لەشکرکێشی بۆ سەر شۆڕشو ڕاپەڕینەکانو جێگیرکردنی دەسەڵاتیان خەرجیان دەکرد)) – تاریخ الخلفاء، ل٣٤٩ – ٣٥٠.

خوێنەر ئێستا وا دەزانێت (السیوطی) ئەمەو وتووە بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە ناوبراو باسی خەلیفەی عەبباسی (المتوکل) دەکات کەپارەی زۆری بەشاعیران دەبەخشیو دوو نموونە لەسەر ئەمە دەهێنێتەوە. ئیتر هیچ لەو قسە گەورانە لەو کتێبەدا نەهاتووە.

٣–ل٢٩١ شوان: شوان جارێکی تر ئەم ڕەفتارە دەکاتو باس لەوە دەکات کەعەرەب چینی دەسەڵاتدار بووو ئەو شتانەیان دەکرد کە لە کەلتووری خۆیاندا باو بووو لایان مەبەست نەبوو ئەمە لەگەڵ بنەماکانی ئیسلامدا بگونجێت یان نا بەمەرجێ مەترسی کورسیو دەسەڵاتی تیادا نەبووایە – تاریخ الخلفاء ل٢٥١–٢٥٢. ئەمەش هەڵبەستنێکی زەقە چونکە سیووطی باس لەخەلیفەی ئومەوی (الولید کوڕی یزید کوڕی عبدالملك) دەکات و بەخەلیفەی فاسق ناوی دەباتو دەڵێت خەڵکی لەبەر ئەو فسقەی کوشتیان، واتە سیووطی باس لەحاڵەتێکی تاك دەکاتو ڕەخنەی لێدەگرێت کەچی شوان، کە لێرەدا لێمان دەبێتە واعیز، بێئەوەی هیچ حسابێك بۆ ئەمانەتی زانستی بکات سیغەیەکی گشتکار بەو حاڵەتە دەداتو ئەو قسە گەورانەی سەرەوە دەکات.

لەهەمان لاپەڕەدا باس لەوە دەکات کە ئافرەت وەکو حاڵی بەر لەئیسلامی لێهاتەوەو دەتوانرا ئەو ژنانە بکڕنو بفرۆشنو تەنانەت پێشکەشی یەکتریشی بکەن.

ئەم قسەیەشمان لە باسی کتێبی (اخبار النساء)دا بینیو بینیمان چۆن مەسەلەکە باسی جاریەیەکی سولەیمان کوڕی عبدالملكو غیرەتی سولەیمان بوو. لەمەی سیووطیشدا شوان لاپەڕە ٣٤٩–٣٥٠ دەنووسێت کەچی نەباس لەکڕینو فرۆشتنی ئافرەتو نەباس لەپێشکەش کردنیان کراوە.

**بیستو چوار: (محاضرات تاریخ الامم الاسلامیة)ی محمد خضری بك:**

١–ل١٤٦ شوان: گوایە عومەر نامەی بۆ (المثنی) ی ناردبوو کە ((زێتر ڕووبدە وشکانیو ئاگاداری دواوەی لەشکرەکەت بەو لەنزیك ئەوانەوە لەسەر سنووری خاکی ئەوانو خاکی خۆمان ئۆردووەکەت دابمەزرێنە، تا فرمانی منت پێ دەگات)) – محمد خضری بك، ج١، ل٢٣.

جگە لەهەڵەی ناوی سەرچاوەکە، ئەوەی شوان باسی دەکات لەلاپەڕە (٢٠٣)دایە نەك (٢٣) – دیارە هەڵەی چاپە – ئەویش بەشێوەیەکی تر. نامەکە فەرمانیان دەداتێ بکشێنە دواوەو لەناو عەجەمەکاندا نەمێننەوەو لەو ئاوانەی لەم لای سنووری خاکەکانیان بڵاوببنەوە.

٢–ل٢١٠ شوان: شوان لەوە دەپرسێت ئایا کام لەشکر جەزیرەی گرتو بۆچوونی یەکەم دەڵێت کە تەنها لەشکری عیراق بووەو ناوی ژمارەیەك سەرچاوە دەنووسێت کە یەکێکیان کتێبەکەی سەرەوەیە، ج٢/ل٢١٨.

ئەو بەشو لاپەڕەیە کۆتایی کتێبەکەیەو باسی دیوانەکانو نووسینەوەیان.. تاد دەکاتو ئەوەی شوان دەیڵێت لەبەشی یەکەم لاپەڕە (٢١٨) دایەو ئەوە هاتووە کە سێ بەش لە کووفە (لە عیراقدا) دەرچوون بەڵام سەرکردەی گشتی (عیاض) بووو ئەمە سووك کردنی باری سەرشانی لەشکری شام بوو. ئەم سێ بەشەش هەریەکەیان بۆ شوێنێك بوو: گرتنی (الرقة)و گرتنی نەسیبینو سێیەمیان عەرەبی جەزیرە بهێنێتە ژێر ڕکێفی موسڵمانان. جیاوازیی نێوان ئەمەو قسەکەی شوانیش ئاشکرایە.

**بیستو پێنج: (کتاب الوزراء والکتاب)ی (الجهشیاری):**

١-ل٩٣ شوان: کاك شوان لە باسی ئاینی زەردەشتیو هۆزی مەجووسی ئەمە دەنووسێت: ((واتە ئەم هۆزە لە پێشەنگی هۆزەکانی تر بوو لە پەیڕەوکردنی ئەم ئاینەو هەربۆیە لەسەرچاوە ئیسلامییەکان بەئاینی زەردەشتی دەگوترێ ئاینی مجوسی)) – الجهشیاری، ل٧.

ئەمە لەکاتێکدا نووسەر ژمارەیەك ئامۆژگاری بۆ پادشایانو وەزیران دەنووسێتو باسی پەرویز کوڕی هورموزو نەوشیروان دەکات، تەماشای تەنانەت پەڕەکانی پێشو دواش بکە دەبینی هیچی وای تێدا نییە.

٢-ل١٠٤-١٠٥ شوان: شوان باس لە دەلالەتی شارو پاشماوە شوێنەوارییەکان لەسەر ئەوەی ئاینی زەردەشتی تاڕادەیەکی گەورە لە هەرێمە کوردییەکان بڵاوبۆتەوە دوای ئەوەی ئاینەکە کۆڵەکەی حوکمی ساسانیی جێگیر کرد.. . الجهشیاری، ل٧.

یەكو شەش لەمە نییەو ئەمە هەمان خاڵەکەی سەرەوەیە.

٣-ل٢٧٧ شوان: کاك شوان باسی (الایغار) دەکاتو دەڵێت ((بریتی بوو لە پێدانی پارچەیەك زەوی لەلایەن خەلیفەوە بۆ هەرکەسێك کەخۆی هەڵیبژاردبایەو ئەو کەسە باجی خەراجی لەسەر نەبوو، یاخود ڕاستەوخۆ باجی خەراجی دەدا بەخودی خەلیفە لەبری والییەکان)) – الجهشیاری، ل٦١.

بۆم نەکرا دڵنیا بم لەواتای (الایغار) کە شوان هێناویەتی (هەموو شتێکی کاك شوانیش جێگەی گومانە). بەهەرحاڵ جەهشیاری یەك وشە لەم بارەیەوە ناڵێت. ناوبراو چیرۆکی کابرایەك دەگێڕێتەوە زەوییەکەی تووشی کارەسات بوو و داوای کرد خەراجی ئەو ساڵەی لێنەسنرێتو دووسەد هەزار درهەمی بەقەرز بدەنێ!

٤-ل٢٧٧ شوان: لەهەمان لاپەڕەدا باسی گرنگیدان بەلایەنی خزمەتگوزاری کە لەبڕی باجەکانو چاکسازی زەوییەکان سازدرا.. لەپەراوێزیشدا ئاماژە بۆ سەردەمی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز دەکات کەئەم کارانە بەپوختیو لەسەر بنەماکانی باوەڕەکەی ئەنجامی دان – الجهشیاری، ل٦٠، ١١٧.

لاپەڕە (٦٠) باسی (ابو العباس السفاح)ی عەبباسی دەکاتو لاپەڕە (١١٧) باسی خەلیفە مەهدیی عەبباسی دەکاتو هیچیان باس لە خزمەتگوزاری ناکەن.

شوان چەند دێڕێك پێش ئەمە باسی زوڵمی دەوڵەتی خیلافەت دەکاتو باسی ئەوەی کردووە هەموو شتێك بۆ ڕەگەزی عەرەب بووو پاشان دەڵێت خزمەتگوزاری دەکرا سەرەڕای ((ئەم دۆخە پڕ لەشەرمەزارییەی دەوڵەتی خەلافەت..))، باشە ئەی دەبێت چەند کەس باسی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی پڕ شەرمەزاری بکەن؟

## بیستو شەش: (التنبیە والاشراف)ی (المسعودی):

١-ل١٣٣ شوان: شوان باسی بنەماڵەی ساسانییەکان دەکات ((چونکە ئەردەشێر کوڕی ساسان کوڕی بابك کوڕی زرار کوڕی بهافرید کوڕی ساسانی گەورە، کە بەڕەچەڵەك خۆیان دەگەیەننەوە داریۆشی سێیەم کە ئەسکەندەر زۆری بۆ هێناو دارو دەستەکەی خۆی کوشتیان)) – التنبیە والاشراف، ل١٠٣[٦٦].

(ل١٠٣)ی کتێبەکە باس لە هەندێ شتی فەلسەفی دەکات لەکاتێکدا باسی ساسانییەکان لەلاپەڕە (٨٧) دایەو نووسەر دەڵێت: یەکەمیان ئەردشێر کوڕی بابك کوڕی ساسان کوڕی بابك لەکوڕانی بەهمەن.. تاد هەروەها هیچ باسی ئەوە ناکات کە ((خۆیان دەگەیەننەوە..)).

٢-ل٢٦٦ شوان: شوان دەڵێت هەرێمە کوردییەکان ((چەندین جۆری پیشەسازیی پێشکەوتووی ئەوسای تیادا بوو)) – التنبیە والاشراف، ل٦٠. بەڵام لاپەڕە (٦٠) باسی ئەندەلوس دەکات، ڕەنگە ئەمە لەلاپەڕە (٣٧)دا بێت کە باس لەسەوادی عیراق دەکاتو دەڵێت لە هەموو پیشەیەکدا لێهاتوون. دیارە شوان کە لە کتێبەکەدا گەشتۆتە ئەو ئەنجامەی

[٦٦] شوان لەلیستی سەرچاوەکانیدا بۆ ساڵی چاپی نووسیویەتی (دون التاریخ) – ڕاستەکەی (دون تاریخ)، ئەو چاپەش کە بەکارم هێناوە لەسەری نووسراوە ١٣٥٧-١٩٣٨و لەسەر وێنەکەی چاپخانەی (المثنی) لەچاپی داوەتەوە.

سەوادی عێراق کوردی تێدا بوو[٦٧] لێرەدا لەبری سەوادی عیراق تەعبیری (هەرێمە کوردییەکان)ی بەکارهێناوە. ئەوە ئەگەر بڵێین کاک شوان بەڕاستی کتێبەکەی دیبێت.

**بیستو حەوت – (صبح الاعشا في صناعة الانشا)ی (القلقشندي):**

١–ل٤١ شوان: کاک شوان باس لە (جۆلەمێرگ)[٦٨] دەکات کە ((لە نێو شارەکانی سەر بە موصلْ دەژمێردرێ، وە دانیشتوانەکەی کوردن و پێیان دەڵێن کوردی چۆڵەمێرگ)) – القلقشندی ج٤/ ل٣٧٧ (بە تەنیا).

بەڵام ئەو کتێبە (ل٣٧٦–٣٧٧) ئەمەی تێدایە: جولەمێرگ شوێنی تاقمێکە پێیان دەوترێت جۆلەمێرگییەکان (الجولمركية) (..)و دەوترێت کە تاقمێکی عەرەبی بەنو ئومەییەن پەنایان بۆ ئەم کێوانە بردبوو کاتێك بەنولعەبباس بەسەریاندا زاڵ بوونو ئەم تاقمەی بەنو ئومەییە لەناو کوردەکاندا لەوێدا مانەوە.

٢–ل٤١ شوان: کاک شوان پاش ئەوە بەدوو دێڕ دەڵێت ((وە چۆڵەمێرگ بەکشتوکاڵ بەناوبانگە)) – القلقشندی ج٤/ ل٣٧٧. بەڵام بابزانین قەلقەشەندی چی دەڵێت: ناوبراو باسی قەڵاکەی دەکات کە یەکێکە لە قەڵا هەرە قایمەکانو لەسەر چیایەکی تەنیایە (..)و سەری ئەو چیایە بۆ کاری کشتوکاڵ فراوانە!!

٣–ل٢٦٦ شوان: ((هەرێمە کوردییەکان بەگشتی هەڵکەوتەیەکی ستراتیژیی گرنگیان هەبوو، ئەمەش وایکردبوو ببنە مەڵبەندێکی گرنگی بازرگانی نێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا)) – القلقشندی ج٤/ل ٤٠٦. هیچ لەم قسانەی تێدا نییە بەڵکو تەنها باسی ماوەی نێوان شارەکان لەناوچەکانی کرمانو ئەرمینیاو ئازەربایجان.. تاد.

**بیستو هەشت – (کتاب البلدان) ی (الیعقوبی):**

١–ل٥٦ شوان: لەبارەی نەهاوەندەوە دەڵێت ((بەکۆنترین شار دادەنرێت لەهەرێمی چیا))– کتاب البلدان ل٣٩. یەك وشە لەم قسەیە نەنووسراوە.

٢ – ل٥٦ شوان: ئەم جارەش نەهاوەند: ((ڕووبارو باغو بێستانی زۆرە)) –کتاب البلدان، ل٣٩. یەك وشە لەمە نییە.

٣–ل٥٦ شوان: دیسان نەهاوەند: ((دانیشتوانەکەی تێکەڵاون لەکوردو فارسو عەرەب)) – کتاب البلدان، ل٣٩ (بەتەنیا).

الیعقوبی دەڵێت: تێکەڵەی عەرەبو عەجەم تێیدا نیشتەجێن.

**بیستو نۆ –(مختصر کتاب البلدان)ی (ابن الفقیە):**

١–ل٧١ شوان: دەربارەی زەنجان ((سەر بەهەرێمی چیاکانە)) – ابن الفقیە، ل٢٠٩.

بەڵام ناوبراو باسی نووسراوێکی فارس دەکات کەتیایدا ئەوە هاتووە قوباد کوڕی فەیرووز ناوچەکانی مەملەکەتەکەی جیاکردەوە.. لەمەشدا ئەوە هاتووە کەئەو شوێنانەی لەهەموو شوێنەکانی تر پڕ نەخۆشییە شەش شوێننو زەنجان یەکێکیانە (ل٢٠٩–٢١٠). ڕەنگە شوان ئەوەی دیبێ لەلاپەڕە (٢٠٩) بەشێك هەیە لەسەر هەرێمی (الجبل) کەچوار دێڕە دواتریش باسی قرماسینو لەم بەشەدا ناوی زەنجان هاتووە.

٢–ل٧١ شوان: دیسان زەنجان: ((دوا سنوورو تخوبی جیاکەرەوەیەتی لەگەڵ هەرێمی ئازربێجان)) – ابن الفقیە ل٢٨٥.

واتە: زەنجان دوا سنووری هەرێمی چیایەو ئەم هەرێمە لەهەرێمی ئازەربایجان جیادەکاتەوە. بەڵام (ابن الفقیە) دەڵێت سنووری ئازەربایجان (یاخود درێژبوونەوەی) لەسنووری (بەرذەعە) تا سنووری (زەنجان)ە. واتە باس لەئازەربایجانەو هیچیش لەبارەی سنووری جیاکەرەوەی نێوان هەرێمی چیاو هەرێمی ئازەربایجان نەوتراوە.

---

[٦٧] بەڵگەکەی شوان زۆر خۆشو سەیرە: ئەو هەرێمە سنووری ئتنیکی فارس نەبووە (چۆنو لەبەرچی نازانین)و هەروەها عەرەبیش هێشتا تەعریبی ئەو دەڤەرەی نەکردبوو. (ل١٤٦).

[٦٨] نەمتوانی لەفزی دروستی ناوەکە بزانم بەڵام بە تەئکید ئەوە نییە کە شوان نووسیویەتی واتە چۆڵەمێرگ.

٣- ل٦٩ شوان: لەبارەی (سیسەر)ەوە دەڵێت: ((لەوەڕگای مەڕو ماڵاتی کوردە شوانکارەکان بووە)) - ابن الفقیە ل٢٣٩.

ئەمە لەکاتێکدا ناوبراو باسی تەنها سیسەر ناکات بەڵام ئەوانەش کەسەر بەون (یان دەوروبەرەکەی)و پاشان دەڵێت (کوردەکان و غەیری ئەوان).

شتێکی خۆشیش دەربارەی ئەم کتێبەی (مختصر کتاب البلدان) ئەوەیە لەگەڵ کتێبی (المختصر في اخبار البشر)ی (ابو الفداء) لەچەند شوێنێکدا تێکەڵ بەیەك دەکات و جارێك دەنووسێت (مختصر کتاب البشر)و جارێکی تر دەنووسێت (مختصر اخبار البشر). نموونە لەسەر ئەمەی دوایی :

٤- ل١٧٠ شوان: شوان باسی نەهاوەند دەکات و سێ دێڕو نیو لەسەر پێشنیاری (طَلْحة کوڕی خُوَیْلِد) دەنووسێت کەچی بکەن و چی نەکەن. کاك شوان لەپەراوێزدا دەنووسێت: ابن الفیە -هەڵەی چاپە ڕاستەکەی (ابن الفقیە)ە-: مختصر اخبار البشر ل٢٥٨ -٢٥٩. کەچی لاپەڕە ٢٥٨-٢٦٠ی کتێبەکەی ابن الفقیە (مختصر کتاب البلدان) باسی لەنەهاوەندو گرتنی دەکات و هیچ لەم قسانەی تێدا نییە.

## سی : (مروج الذهب)ی (المسعودی)

١-ل٧٠ شوان: ((هەمەدان شارێکی کوردنشینە)) - المسعودی ج٢/ل ١٠١ (بەتەنیا).

مەسعوودی دەقی ئەم قسەیە ناڵێت بەڵکو دەڵێت کە جۆرێك لەکوردەکان (شوهجان)ن و لەشاری (دینەوەر)و (هەمەدان) دان (لاپەڕە ١٢٤ی چاپی لای خۆم).

٢-ل٧٥ شوان: شوان باسی (کازەروون) دەکات کە ((کوردی زۆرەو ژمارەو ئاماری ناکرێ)) -المسعودی ج٢/١٠١.
بەڵام مەسعوودی یەك وشە لەبارەی ئەمەوە ناڵێت[٦٩].

## سی‌ویەك: (مراصد الاطلاع) ی (ابن عبدالحق البغدادی)

لەکەمێك خاڵ کە دەستنیشانم کردوون تەنها تەماشای ئەمەی خوارەوەم کردووە.

ل١٨ شوان: شوان باسی نیشتەجێ بوونی کورد لەبەشی باکووری جەزیرەو لەپشتی چیای جوودی‌و هەروەها دەوروبەری دەریاچەی وان - مراصد، ج٣/ ل١٤٣.

بەڵام ناوبراو باسی وشەی (وسطان) دەکات ئەویش لەبابەتی شیعر ئینجا دەڵێت: (وسطان) هەروەها خاکێکی کوردانە.

## سی‌و دوو: (المسالك والممالك)ی (الاصطخري):

١-ل٧٠ شوان: هەمەدان نزیکەی ٣٥-٤٥ کیلۆمەتر لەحولوان دوورە - الاصطخری ل١١٨.

بەڵام ناوبراو ماوەی نێوان هەموو شوێنەکانی نێوان هەمەدان و حولوان دەژمێرێت کە دەکاتە ٦٧ فەرسەخ واتە نزیکەی ٣٧٠ کیلۆمەتر[٧٠]. دیارە ئەمە ڕاستەڕێ نییە بەڵام گرنگ ئەوەیە (الاصطخری) باسی ٣٥-٤٥ کیلۆمەتر ناکات.دەبوایە شوان سەیری ئەو نەخشەیەی لە کتێبەکەی خۆیدا دایناوە تا بزانێت ماوەی ڕاستەڕێ نێوان دوو شارەکە نزیکەی٢٥٠ کیلۆمەترە!

٢-ل٧٠ شوان: باسی هەمەدان: ((شارێکی گەورەیەو قەوارەکەی نزیکەی ٦کلم چوارگۆشەیەو چوار دەرگای ئاسنی هەیە)) - الاصطخری ل١١٧. بەڵام (الاصطخری) -ڕاست بێ یا موبالەغە - دەڵێت فەرسەخ بە فەرسەخە (واتە نزیکەی ٣١

---

[٦٩] جارێکی‌تر دەڵێم مەبەست خودی زانیارییەکە نییە بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئەو زانیارییەی شوان دەیڵێت یان لەسەرچاوەکەدا نییە یان بەهەڵە نووسراوەو ئەمانە بۆ سەلماندنی ئەوەیە شوان سەرچاوەکەی نەدیوە یان ئەگەر دیبێتی بەئەمانەتەوە زانیارییەکەی نەقڵ نەکردووە یان لێ تێنەگەشتووە.

[٧٠] لە سەرچاوەی خوارەوەدا دکتۆر صوبحی پاش موناقەشەی درێژیی ئەندازەی (گەز- ذراع) دەگاتە ئەنجامێك و لەوەوە فەرسەخ بە بۆچوونی ئەو دەکاتە ٥٥٤٤ مەتر: د. صبحي الصالح، النظم الاسلامية ، ل٤١٧. شوان خۆی پشت بە سەرچاوەیەکی تر دەبەستێت بۆ ئەندازەی فەرسەخ کە نزیکەی ٦ کیلۆمەترە (ل٢٢ ، پ. ٦). من وەکو خاترانە بۆ کاك شوان تەقدیرە کەمەکەم وەرگرتووە.

کیلۆمەتر دووجا بە تەقدیرە کەمەکە). ئینجا ئەگەر فەرسەخ نزیکەی ٦ کیلۆمەتر بێت (بڕوانە پەراوێزی سەرەوە) کاک شوان وا لە تەعبیری ((فەرسەخ بە فەرسەخ)) تێگەشتووە: فەرسەخ (= ٦ کیلۆمەتر) بە فەرسخ (= ٦ کیلۆمەتر) دەکاتە فەرسەخ دووجا (=٦ کیلۆمەتر دووجا)!! دیارە قوتابییەکی ناوەندی دەزانێت ئەمە دەکاتە ٣٦ کیلۆمەتر دووجا نەک ٦ !!

٣-ل٧١ شوان: شوان باسی زەنجان دەکات کەسەر بەهەرێمی چیاکانە – الاصطخری ل١١٥.

بەڵام ناوبراو دەیخاتە هەرێمی (دەیلەم) نەک (چیاکان). بڕوانە هەروەها یەکەم خاڵی (ابن الفقیه) ژمارە بیست و نۆ.

## سی و سێ: (النزعات المادیة في الفلسفة الاسلامیة)ی (د. حسین مروة):

١-ل٢٦٧ شوان: شوان قسەیەکی دوورودرێژ لەبارەی ئاستی نزمی بژێوی عەرەب دەکات. پاشان دەڵێت کەچارەسەرەکە ئەوە بوو لەشکرکێشی بۆ ژینگەیەکی پڕ بەرهەمو خاوەن ئاستی بەرزی بژێوی بکرێت –د. حسین مروة، ج١/ل٤١٥.

بەڵام ناوبراو باسی شتێکی تر دەکات. ئەو باس لەناڕێکی نێوان ژێرخانی ئابووریی وڵاتە گیراوەکانو سەرخانە سیاسیو ئیدارییەکانی فاتحەکان، پاشان دەپرسێت:فاتحەکان کارو ڕەفتاریان چۆن بوو؟ وەڵامی ئەم پرسیارەش دەداتەوە.

٢-ل٢٦٧ شوان: ((واتە هۆکاری ئابووری ڕۆڵی گرنگو کاریگەری لەسەرکەوتنە یەك بەدوایەکەکانی لەشکری عەرەبە موسڵمانەکان لەبەرە جیاوازەکاندا بینی)) –د.حسین مروة، ج١، ل٤١٥-٤١٦. ناوبراو هیچ لەمە ناڵێتو هەمان باسەکەی سەرەوە دەکاتو باس لەچۆنێتی مامەڵە (دەستکەوتی شەڕ، جزیە) دەکات.

٣-ل٢٦٩ شوان: شوان لەپەراوێزدا باسی جیاکردنەوەی پێنج یەکی دەستکەوتەکانی شەڕ بۆ دەسەڵاتی یەکەمو باقیەکەی بۆ جەنگاوەران..و خەلیفە دەیتوانی دیلەکان ئازادبکاتو بۆی هەبوو بیانکوژێت بەڵام ژن و منالٚ نابێ بکوژرێن بەتایبەتی ئەگەر لەئەهلی کتاب بن –مروة،ج١، ل٤١٥. لە هەموو ئەم قسانە نووسەر تەنها باسی جیاکردنەوەی پێنج یەك و باقییەکەی دەکات.

## سی و چوار: (البابکیة)ی (د. حسین قاسم العزیز):

ل٢٦٧ شوان: سەبارەت بەخاڵی (٢)ی کتێبەکەی (مروة) شوان هەروەها ناوی ئەم کتێبە (لاپەڕە ٤٥) دەبات بەڵام دکتۆر حسێن یەك وشە لەم بارەیەوە ناڵێت بەڵکو تەنانەت باسی سەردەمی پێش ئیسلامیش دەکات.

## سی وپێنج: (عجائب الاقالیم السبعة)ی (سهراب):

ئەوەی دیومە یەك جار ئەو کتێبە بەکارهاتووە ئەویش لە لاپەڕە (٨٥)و بەم جۆرە: نێوان (نقجوان)و دوین " دبیل "نزیکەی ١٥٠ کیلۆمەترە– سهراب، ل١٤٩.

ئەم فەسڵەی کتێبەکە باسی ڕووبارەکان دەکات. یەکێکیان ڕووبارێکە بە چەند شوێنێکدا دەڕوات کە (نشوی) یەکێکیانە. ئیتر نەباسی ماوەی نێوان دوو شارەکە هەیەو نەهیچ شتێك لەم جۆرە. نەوەکو مەسەلەش هەڵەی چاپ بێت لاپەڕە ٩٤ و٤٩ گەڕامو ئەوەی تێدا نەبوو.لاپەڕە ١٩٤ یش پێڕستی بابەتەکانی کتێبەکەیە.

## سی و شەش: گەشتەکەی ئیبنو جوبەیر

شوان چاپی (دار صادر) دەنووسێت، منیش دوو چاپم دەستکەوت" یەکەمیان هی چاپخانەی (بریل) لە (لیدن)و دووەمیان هی چاپخانەی (السعادة) لە قاهیرەو ئەمەی دواییان لاپەڕەکانی یەکن لەگەڵ ئەو لاپەڕانەی لە کتێبەکەی شواندا هاتوونو لاپەڕەکانی ئەوم نووسیوە. شوان دوو جار ژمارە لاپەڕە (١٧١) دەنووسێت جارێك بۆ ماردین و ئەوەی تر بۆ نەسیبین بەڵام باسی ئەم دوو شارە لە چەند لاپەڕەیەکی کەمدان : ل٢١٧-٢١٩و ئەو دەورووبەرە ، ئەمە لەکاتێکدا ئەو بازە گەورەیە بۆ لاپەڕە ١٧١ دەمانگەیەنێتە باسی شاری مەدینەو مزگەوتی پێغەمبەر ρ تەنانەت لە چاپی لیدنیش کە لاپەڕەکانی جیان، ئەمەش باشتر ڕوون دەبێتەوە کاتێك تەماشای پێڕستی ناوەکان لەم چاپەدا بکەین. وەنەبێ تەنها ئەمە

گومان دروست بکات کە شوان کتێبەکەی نەدیبێ. خاڵەکانی خوارەوە گومانەکە بەهێزتر دەکەن. تەنها یەك جار زانیاریی دروستم لەبارەی کتێبەکەوە بینیوە(لاپەڕە ٢١ پەراوێزی ٧). شوان تەنانەت ناوی نووسەر بە دروستی نانووسێت و لەجیاتی ابن جُبیر(ئیبنو جوبەیر) دەنووسێت: ئیبن جەبیر(ل٢٣).

١-ل٢١ شوان: شوان وا باسی نەسیبین دەکات: بە بنکەی دەڤەری رەبیعە دادەنرێت و چیای جوودی دەکەوێتە بەشی باکووری و هەروا خۆشی دەکەوێتە باکووری ژەنگار" سنجار" -ئیبنو جوبەیر، ل١٧١.

سەبارەت بە ناوبردنی هەڵەی لاپەڕە ١٧١ بڕوانە سەرەوە. ئیبنو جوبەیر باسی خۆی دەکات کە بەلای چیای جوودیدا دەڕوات و دواتر لە گوندێکی سەر بە نەسیبیندا دەمێنێتەوە (ل٢١٧). ناوی جوودی دوو جار لە کتێبەکەدا دێت (بڕوانە پێڕستی ناوەکان لە چاپی لیدن) کە ئەمە یەکێکیانەو ئەوەی تر پەیوەندیی بەم باسانەوە نییە. سنجاریش یەك جار ناوی دێت و هیچی تێدا نییە لەوەی شوان باسی دەکات (ل٢١٨)، باسی نەسیبینیش لە چەند شوێنێکدا کراوە کە ئەوەی لە باسەکانی شوانەوە نزیك بێت تەنها ئەوەی باسی جوودیی تێدا کراوە. ئەمە چی دەگەیەنێت؟ خاوەنی گەشتەکە دەڵێت بە چیای جوودیدا تێپەڕی پاشان لە گوندێکی سەر بە نەسیبین مایەوە، شوانیش وای لێ دەکات: چیای جوودی دەکەوێتە باشووری نەسیبین!

٢- ل٢٢-٢٣ شوان: لەبارەی ماردینەوە: دانیشتوانەکەی تێکەڵن لە کوردو تورکمان و عەرەب، زۆربەیان موسڵمانن وبەشێکیان مەسیحین - ئیبنو جوبەیر، ل١٧١.

سەرەڕای هەڵەی لاپەڕەکە تەنها یەك جار باسی ماردین کراوە (ل٢١٩)و باسەکەی تەنها دێڕێکە ئەویش کە لە قەدپاڵی چیایەکدایەو باسی قەڵاکەی کراوە کە گەورەیەو قەڵایەکی ناوداری جیهانە.

٣- ل٢٣ شوان: دوای باسەکەی سەرەوە شوان باسی شاری دارا دەکات گوایە ئیبنو جوبەیر دەڵێت: ((شارێکی ئاوەدانەو قەڵایەکی هەیە لە قەڵا بەناوبانگەکانی دونیایە))- ئیبنو جوبەیر، ل٢١٩.

ناوبراو وا ناڵێت" ئەو دەڵێت دارا شارێکی دێرینەو دوای ئەوەی ناوی قەڵاکەی دەبات دەڵێت نیو قۆناغ لە ماردینەوە دوورە (ل٢١٩) ئینجا باسی ماردین دەکات(خاڵەکەی سەرەوە) واتە گەشتیارەکە وەسفی قەڵای ماردین دەکات نەك قەڵاکەی دارا.

٤- ل٢٣ شوان: هەر لەبارەی داراوە شوان باسی سەرچاوەی ئاوی زۆری و باخ و بێستانی زۆری دەکات و دەڵێت: بۆیە هەر لە زووەوە کوردی تێدا نیشتەجێ بووە.

سەرەتا نازانم چ پەیوەندییەك هەیە لەنێوان هەبوونی ئاوو باخی زۆر لەلایەك و نیشتەجێبوونی کورد لەو شارەدا لەلاکەی تر تا شوان وشەی (بۆیە) بەکاربهێنێت؟

بەهەر حاڵ شوان تەنها ئەم ڕستەیە لە ئیبنو جوبەیر وەردەگرێت: بۆیە هەر لە زووەوە کوردی تێدا نیشتەجێ بووە(ئیبنو جوبەیر،ل٢١٩- بەتەنیا).

بەڵام ئیبنو جوبەیر ئەمە ناڵێت بەڵکو باسی گەشتەکەی لە نەسیبینەوە دەکات و باسی وریایی خۆیان دەکات لە پەلاماری کوردەکان کە ئەمانە ڕێگری دەکەن و تەنانەت دەگەنە دەرگای شاری نەسیبین... ئیبنو جوبەیر پاش ئەم قسەیە دەڵێت کە لەلای ڕاستی ڕێگەکە شاری دێرینی دارای بینی و پاشان ئەوە دەنووسێت کە لەسەرەوەدا باسمان کرد (ل٢١٩). ئیتر نازانم شوان ئەوەی لە کوێ هێنا، خۆ ئەگەر ئەم باسەی ئیبنو جوبەیری لە شوێنێکدا بینیبێت ئەوا نەشتەرگەرییەکی وای بۆ قسەکە کردووە کە سەر لە بنیەوە ناناسرێت.

٤- ل٣١ شوان: لەبارەی (رأس العین)ەوە: ئەم شارە لە ئاستی زەوی نزمترە، سەرچاوەی زیاتر لە ٣٠٠ کانیی لێیە - ئیبنو جوبەیر، ل٢٢١.

گەشتیارەکە باسی ئاوی زۆری شارەکە دەکات و بەتایبەتی وەسفی دوو سەرچاوە دەکات(ل٢٢١-٢٢٢)، بەڵام باسی ژمارەی کانییەکانی نەکردووە. ئەم ژمارەیە لە کتێبی تردا هاتووە. باسی ئاستی نزمی زەوییەکەشی ناکات.

سی وحەوت: (کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا)ی (عباس عبدالکریم)

ئەوەی بیدیومە شوان یەك جار ناوی ئەم کتێبەی نووسیوە. شوان(ل٢٧١) باسی باجی خەراج دەکات کە هەرچەندە لە دەقی قورئاندا نەهاتووە بەڵام دوای جێگیربوونی دەسەڵاتی عەرەبە موسڵمانەکان ئەمانە لە سایەی ئەو باجانەدا بوونە چینێکی دەوڵەمەندو ئەرستۆکرات –عەباس، ل١٧ (بە تەنیا).

عەباس لەم لاپەڕەیەدا تەنها وشەی (ئەرستۆکرات)ی وتووە کە لە قسەکانی سەرەوەی شوان بچێت. عەباس باس لەوە دەکات تاکی عەرەب لە قۆناغی یەکەمی ئیسلامدا بایەخی بە زەوی نەدەداو ئەمە پەیوەندیی بە نیزامی کۆمەڵایەتیی ئەوسای کۆمەڵگەی عەرەبەوە هەیە کە سەرۆکی خێڵ جێگای هەموو خێڵی گرتۆتەوە...و دەستکەوتی شەڕەکانی سەرەتای ئیسلام لە کەلوپەل‌و زەوی‌و زار... لە ڕێگەی سەرۆکی خێڵەوە دراوە بە خێڵ‌و ((هەر ئەم نەریتەش بووەتە فاکتەری هێنانە کایەی توێژێکی ئەرستۆکراتی))، هەروەها لە هەمان لاپەڕەدا دەڵێت: چونکە لە سەرەتادا بایەخ بە سامانی نەقدی نەك بە زەوی دەدرا ئەمە توێژێکی ئەرستۆکراتی سەربازیی لێ دروستکردن..

عەباس ئەمەی وتووە کەچی ئەوە بوو نەقڵکردنەکەی شوان. ئەمەش دەچێتە پاڵ نموونەی تری ئەو ڕاستییەی کە شوان تەنانەت لە سەرچاوە کوردییەکان تێنەگەشتووە، بێگومان ئەو سەرچاوانەی دیونی.

لێرەشدا موناقەشەی قسەکەی عەباس (کە دوایی لە چاپی دووەمدا دەرکەوت ئەو عەباسە فوئاد مەجید میسرییە) ناکەین دەنا ئەویش شایستەی ئەوەیە وەکو مامەڵەی کتێبەکەی شوانی لەگەڵدا بکرێت. تەنها لە هەڵدانەوەی چەند لاپەڕەیەکی کتێبەکەو تەماشایەکی سەرپێیی ئەو لاپەڕانەو بێ گەڕانەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی عەباس ناوی بردوون ژمارەیەك هەڵەم بینی. دواتریش کە زانیارییەکانی عەباسم لەگەڵ دوو سێ سەرچاوەدا بەراورد کرد بۆم دەرکەوت ئەویش ((شوانییات))ی هەیە*. شایەنی وتنە حزبێکی کوردستانی وەك بیستوومە کتێبەکەی عەباسی وەکو وانە بە کادرەکانی دەڵێتەوە، ئەمەش نەگبەتییەکی تری خوێندەوارییە لە کوردستاندا.

## سی‌و هەشت: (حیاة الحیوان الکبری)ی (الدمیري)

ل٢٩٦ شوان: تەنها یەك جار دیومە شوان ئەمەی بەکارهێنابێت. لەو جارەشدا گوایە ئەمە هەیە: .. گەلانی ئێران تەنها لە ماوەیەکی کەمی مێژوودا، تا ڕادەیەك لە دەروازەی کوردەوە بۆ گۆڕەپانی سیاسی گەڕانەوە، ئەویش بە دەرکەوتنی (ابو مسلم الخراساني) کوردی بوو – الدمیري ج١، ل١٢ (بەتەنیا).

خوێنەر وا دەزانێت دمیری ئەمەی وتووە بەڵام حاشا هیچی لەجۆرە وتبێت. ناوبراو لە خانەی باسی (شێر)دا لە سێ لاپەڕەدا باسی ئەبوو موسلیم‌و تایبەتمەندییەکانی‌و کوشتنی لەلایەن ئەبوو جەعفەرلمەنصوورەوە .. دەکات ئیتر نەباسی گەڕانەوەی گەلانی ئێران بۆ گۆڕەپانی سیاسی‌و نەباسی دەروازەی کورد دەکات. تەنانەت دمیری بە ئەکیدی ناڵێت ئەبوو موسلیم کورد بووە بەڵکو دەڵێت:وتراوە عەرەبەو وتراوە لە عەجەمەو وتراوە کوردە. ئەمانە دەیسەلمێنن شوان کتێبەکەی نەدیوەو ئەگەر دیبێتی تا دوا سنوور کارەکەی نازانستی‌و دوور لە ئەمانەتە.

سەیریشم لە عەقڵیەتی نەتەوەپەرستی دێت چۆن داکۆکی لەسەر کوردایەتییە گومانلێکراوەکەی ئەبوو موسلیم دەکرێت‌و شانازیی پێوە دەکرێت ، ئەوەتا هەمان کتێب دەڵێت کە ئەو کەسانەیان ژمارد ئەبوو موسلیم چ لە شەڕوشۆڕو چ بەگیراوی کوشتبوونی بینییان ژمارەیان شەش سەد هەزار کەس بوون (ل١٢)، ئیتر قسەی ڕاست بێت یان هەڵبەستراو.

## سی‌و نۆ: (اثار البلاد واخبار العباد) ی (القزویني)

١–ل٢٠ شوان: شوان باسی شوێنێك دەکات دیار نییە جەزیرەیە یان نێوان زێی گەورەو زێی بچووکەو کە کورد تێیدا نیشتەجێ بووە. ئەمە مەبەستی ئێستامان نییە، مەبەستمان ئەو زانیارییەی کتێبەکە کراوەتە سەرچاوە بۆی کە ئەمەیە : ((بە تایبەتی شاری (اربل) هەولێر)) – قەزوینی، ل٢٩٠.

* ئەمەم لە چاپی یەکەم نووسیبوو، بەڵام دواتر زانیم ئەو کتێبەی میسری یەك پارچە ((بردنە)) لە سەرچاوەی ترەوە.

قەزوینی باسی هەولێر دەکات بەڵام باسی کورد ناکات (ئەگەر خوێنەر بێتاقەت نەبێت ئەمجارەش ئەوە دەخەمەوە یادی کە لێرەدا موناقەشەی خودی زانیارییەکە ناکەم بەڵکو باسی کاری نازانستیی شوان دەکەم دەنا کورد لەکۆنەوە لە هەولێردا بووە).

٢- ل٢١-٢٢ شوان: لە بەشی تایبەت بە باسی شاری نەسیبین و پاش باسکردنی هاتنی نوێنەری مەسیح (سەلامی خوای لێ بێ) بۆ شارو ناوچەی نەسیبین و بڵاوکردنەوەی ئاینەکەیان (کە ئەو سەرچاوەیەی شوان ناوی بردووە ئەو شتە ناڵێت -بڕوانە ژمارە شەش واتە کتێبی قرة العين ، یەکەم خاڵ) شوان دەڵێت : ئەمەو جگە لەو شوێنەوارانەی کە بەڵگەی ڕاستی قسەکەمانن - قەزوینی، ل٥٦٥.

بەڵام لاپەڕە ٥٦٥-٥٦٦ ی کتێبەکە باسی میافارقین و شوێنەوارە نەصرانییەکانی دەکات نەك نەسیبین. شوان هیچ دوودڵییەك ناهێڵێتەوە لەوەی مەبەستی لە نەسیبینە چونکە یەکسەر دوای ئەوە خوێندنگای مەسیحیی نەسیبین بە نموونە دەهێنێتەوە.

سێ خاڵی تری لای خۆم دەستنیشان کردبوو کە دوانیان ((شوانییاتن))و تەنها یەکێکیان ڕاستە (لە لاپەڕە ٢١، پەراوێز ٣).

**چل: (حملة العشرة الاف)ی(زینۆفۆن)**

تەنها یەك جار ئەم کتێبەم بینیوە شوان نووسیبێتی.

ل١٢٨ شوان: شوان لە زاری زینۆفۆنەوە دەگێڕێتەوە ((ئەوانە دانیشتوانی چیان و زۆر ئازاو تیرپاست و ژێردەستیش نین)) -زینۆفۆن، ل١٧٦-١٨١.

گاڵتەجاڕییەکی گەورەش لەم ڕەستەیەدا هەیە. شوان باس لە ((کورد)) دەکات کە لەڕاستیدا زینۆفۆن ناوی کاردوخییەکان دەبات نەك کورد، ئەمەش هەڵەی وەرگێڕی عەرەبیی کتێبەکەیە کە وشەی کوردی بەکارهێناوە. ئەمانەتی زانستی وا پێویست دەکات ناوەکان وەکو خۆیان بنووسرێن. ئێستاش من بەدوای ئەوەدا ناچم کە بۆچی لیژنەی موناقەشەی ماستەرنامەکە بە بەکارهێنانی وشەی کورد ڕازی بوون لەگەڵ ئەوەشدا کە لەو سەردەمەدا لەوە ناچێت کورد وەك نەتەوەیەك پێکهاتبێت، هیچ نەبێت زانیاری لەسەر ئەوە نییە. دەڵێم لەوە ناپرسم چونکە لیژنەکە شتێك زۆر لەوە ئاسانتر بەسەریدا تێپەڕی ئەویش کە شوان ڕستەکەی سەرەوە دەخاتە نێوان جووتە کەوانە کە نیشانەی وەرگرتنی دەقاودەقە کەچی کە ئاماژە بۆ سەرچاوە دەکات دەنووسێت: لاپەڕە ١٧٦-١٨١ ، واتە ئەو دێڕەی کە کاك شوان نووسیویەتی شەش لاپەڕەی لە سەرچاوەکە داگیرکردووە!! کە لیژنەکەش بەمە نەزانێت بێگومان ئەوەش نازانێت کە لەو وەسفانەی لە ناو جووتە کەوانەکەی شواندا هاتوون و بە درێژایی ئەو شەش لاپەڕەیە تەنها ئەمە هاتووە : ئەمانە تیرهاوێژێکی ئەوپەڕی لێهاتوون (ل١٨١)!!

**چل و یەك: (دراسات كردية في بلاد سوبارتو)ی(د. جەمال ڕەشید ئەحمەد)**

ل١١٨ شوان: ((وە لە سەرووی موصڵ ((ئیشو عیاب)) دێرێکی لە قەد چیایەکە دروستکرد لە نزیك هەشتاین و توانی دانیشتوانی کوردی ئەو ناوچەیە بهێنێتە سەر ئاینی مەسیحی)) -دراسات، ل١٠١-١٠٢.

نە ناوی ((ئیشو عیاب))و نە هەشتاین[٧١] و نەئەو باسە هەیە. شوان قسەکەی خستۆتە ناو جووتە کەوانە.

**چل ودوو: (جنوب كردستان)ی (هنری فیڵد)**

١- ل١١٤ شوان: ((واتە سەرەتا لە وڵاتی ئاشوور کە زێتر هەرێمی جەزیرە دەگرێتەوە جوولەکەی تێدا بڵاوبۆوە ، دواتریش لە وڵاتی بابل و هەرێمی چیاو سوسنیا (ڕاستەکەی: سوسیانا/ف.)- خوزستان -و دەورووبەری بڵاوبوونەوە)) - فیڵد، ل٢٥.

[٧١] هەشتاین لەڕاستیدا لای م. عبدالرقیب وەك هەشتیان هاتووەو باوەڕی وایە شوێنەواری گوندی (ثمانين)ە (الدولة الدوستكية، ج١، ل١٧).

بەڵام فیڵد دەڵێت : جوولەکە وەچەی ئەوانەن کە پاش کەوتنی‌نەینەوا پەنایان بۆ کوردستان برد یان کوڕەزای نیشتەجێبووە ئەسڵییەکانن پاش کەوتنی سامیرە.

٢- ل١١٥ شوان: هەر دەربارەی جوولەکە: ((هەروا لە شاری ئاکرێ‌دا هەبوون کە ٢٥ کلم لە شاری موصلْ دوورە)) – فیڵد، ل٢٨.

بەڵام فیڵد دەڵێت ٦٥ میل (واتە زیاتر لە سەد کیلۆمەتر) رۆژهەڵاتی باکووری مووصڵە. جا بریا شوان هیچی نەکردایە تەماشای نەخشەی ناو کتێبەکەی خۆی بکردایە تا بزانێت ئاکرێ چەند دوورە" ٢٥ کیلۆمەتر یان زیاتر! خۆ ئەگەر ئەو ٢٥ کیلۆمەترە هەڵە چاپ بێت ئەی چۆن (میل)ـەکەی فیڵد بە هەڵەی چاپ لای شوان بووە (کیلۆمەتر)؟!

**چل وسێ: (ایران في عهد الساسانيين)ی (کریستنسن)**

١- ل٥١ شوان: باس لە (باجرمێ) دەکات کە لە ناویدا شاری کەرکووك هاتووە (کرخا یان بیت سلوخ) یان (کرخ سلوخ) کە لە سەردەمی سلوقییەکان گەشەی کرد (٣١٢ پ.ز – ١٣٥ پ.ز)و سلوقسی دامەزرێنەری بنەماڵەی سلوقی شوورایەکی بۆ دروستکردووە، تەلارسازیی تێدا ئەنجام داوەو کردوویەتی بە مەڵبەندی شانشینەکەی، بەم شێوەیە مایەوە لە سەردەمی فرثی‌یەکان‌و هەروا ساسانییەکانیش – ایران، ل٢٥٧.

جگە لەنووسینی هەڵەی ناوی کۆنی کەرکووك‌و ناوردی لە سەردەمی سلوقییەکان، کریستنسن هیچی لەم شتانە نەوتووە. کریستنسن باسی مەترانییەتی (کرخا بیت سلوخ) دەکات کە یەکێکە لە پێنج مەترانییەت کە لەژێر سەرۆکایەتیی ئەسقوفی شاری سلوقیەن، ئەویش سەرەتای سەدەی پێنجەمی زاینی.

٢- ل٦٩ شوان: شوان باسی ناوچەی گەیلان دەکات کە لە باکووری ئێراندایە بەلای دەریای قەزوین کەچی لەهەمان باسدا ناوی شاری گەیلان دەبات کە لە لوڕستانی بچووکدایەو سەر بە کرماشانە. ئەمەش تێکەڵکردنێکی تەواوە چونکە ئاشکرایە لوڕستان سەدان کیلۆمەتر لە قەزوینەوە دوورە. بەهەر حاڵ ئەوەی لە کریستنسن وەریگرتووە ئەمەیە: ((ڕێگایەکی سەرەکی بەناو ئەم دەڤەرەدا دەڕوات ئەویش ڕێگای نێوان مەدائن‌و بۆ هەمەدانەو لەوێشەوە بەنێو چیاکانی بز " البز " دا دەڕوات .)) – ایران، ل١١٥(بەتەنیا).

کریستنسن باسی ڕێگا گەورەکە دەکات کە دەگاتە هەمەدان‌و ڕێگەی زۆری لێ دەبێتەوە کە یەکێکیان دەگاتە (ڕەی) نزیك تاران‌و بەناو کێوەکانی گەیلان و زنجیرەی (البرز) بۆ دەریای قەزوین دەڕوات.. ئەمە شوێنی گشتیی ناوچەی گەیلان دیاری دەکات کەچی شوان ناوچەکە دەخاتە ناو هەرێمی چیا لەگەڵ کەنگاوەرو هەمەدان.. کە زۆر لەو گەیلانەوە دوورە. جگە لەوە شوان سوورە لەسەر ئەوەی چیاکانی (ئەلبورز) بە (بز) بنووسێت.

٣- ل١٢٤ شوان: ((هۆکارێکی تری بڵاوبوونەوەی مەسیحیەت شاهنشاهەکانی ئێران بوون چونکە هەرکاتێك شارێکی ڕۆمیان بگرتبا دانیشتوانەکەیان دەگواستەوە..)) تاد – ایران، ل٢٥٣.

کریستنسن ناڵێت ((هەر کاتێك)) بەڵکو ((هەندێ جار)). هەروەها باسی پادشای ساسانی دەکات نەك پادشاکانی ئێران بە ڕەهایی.

**چل‌و چوار: (ڕەوشی ئایینی‌و نەتەویی کوردستان)ی (د. ڕەشاد میران)**

١- ل٩٢ شوان: ((میترا واتە خوداوەندی خۆرو دواتر زرڤانییەکانیش باوەڕیان پێهێنا)) –ڕەوشی ئاینی، ل٢٤.

لەم قسانە تەنها ئەمە هەیە: میترا خوداوەندی خۆرو ڕووناکی.

٢- ل٩٣ شوان: شوان دەڵێت ((ئەوەی زیاتر یارمەتی بڵاوبوونەوەی ئاینی میترای دا دامەزراندنی دەوڵەتی میدیا بوو)) –ئینجا دەڵێت: بۆ زێتر زانیاری بڕوانە د. ڕەشاد میران، ڕەوشی (..)، ل٢٤. (شوان ئەم کتێبەی بەتەنیا نووسیوە).

بەڵام د.ڕەشاد دەڵێت: ئەوەی زەمینەیەکی لەباری بۆ سەرهەڵدانی ئاینی مۆنۆتیزم (تەوحید)ی ڕەخساند دامەزراندنی دەوڵەتی میدیا بوو.. واتە باسەکەی د. ڕەشاد لەبارەی تەوحیدەوەیە نەك میترا پەرستن.

٣- ل٩٥ شوان: ((واتە ئاینی زەردەشتی لێرەدا بازێکی گەورەی داو لە قۆناغی پۆلیتیزم پەڕیەوە بۆ قۆناغی هینۆتیزم – توحیدی))–ڕەوشی ئاینی، ل٢٥ (بەتەنیا).

بەڵام د. ڕەشاد ئەمەی نووسیوە: مادو ئێرانییەکان لە بواری کەلتووری گیانیدا هەنگاوی باشیان بەرەو پێشەوە نابوو لە پۆلیتیزمەوە بۆ هینۆتێیزم پەڕینەوەو لەمەشەوە لە مۆنۆتیزم نزیك بوونەوە.

واتە سەرەڕای هەڵەی تر (مادو ئێرانیی کردووە بە ئایینی زەردەشتی) شوان مۆنۆتیزم (تەوحید)ی پەڕاندووەو بەهەڵە هینۆتیزم (هەبوونی خوداوەندێکی مەزن لەناو کۆمەڵێ خوداوەندی تر – د. ڕەشاد، ل٢٤)[٧٢] ی بۆ تەوحید داناوە، یا با بڵێین هەڵەی چاپە.

٤- ل٢٨٦ پەراوێزی ٣ شوان : د. ڕەشاد لە لاپەڕە (٢٣)ی کتێبەکەیدا باسی چەند شتێك دەکات وەکو پەرستنی شەرابی (هەوما)و باسی ئەفسانەی ئەژدیهای حەوت سەر..و دواتر لە لاپەڕە ٢٤-٢٥ باسە هەنگاونان بۆ مۆنۆتیوم (تەوحید) لای مادەکان وئێرانییەکان (بڕوانە خاڵەکەی سەرەوە)و دکتۆر ڕەشاد ئەمە دەبەستێتەوە بە دەوڵەتی ماد کە تاکە پادشایەکی هەبووو دکتۆر دەگەڕێتەوە بۆ قسەیەکی (ئەنگلز) کە گوایە خودایەکی تاكو تەنیا بێ پادشای تاكو تەنیا هەرگیز پەیدا نەدەبووو خوای تاكو تەنیا نوسخەیەکی کتومتی زۆرداری تاكو تەنیای ڕۆژهەڵاتییە. د. ڕەشاد پاشان دەپرسێت: خۆ ئەکەدو ئاشورو بابل پادشایەکی تاك وتەنیایان هەبووو لەوانەیە زۆرداریی ئەمانە لە هی میدییەکان تێپەڕی کردبێت ئەی بۆچی پێش میدیا فیکری مۆنۆیزم سەری هەڵنەدا؟ د. ڕەشاد هەوڵ دەدات وەڵامی ئەوە بداتەوەو ئەوقسەیەی لە خاڵی (٣)ی سەرەوەماندا باسکراوە دەڵێت واتە مادەکانو ئێرانییەکان لە بواری کەلتووری گیانیدا هەنگاوی باشیان بەرەو پێشەوە نا.. تاد.

لێرەدا نامەوێ موناقەشەی قسە ساکارەکەی ئەنگلز بکەمو تەنها ئەوە دەڵێم کە کاتی ئەنگلز زانرابوو عیراقو میسری کۆن پادشای تاکوتەنیاو لەهەمان کاتدا خوداوەندی زۆریان هەبووە، بەلای کەمەوە ئەگەر لە ڕێگەی دەستکەوتی شوێنەوارناسانەوە نەبێت ئەوا لە باسەکانی یۆنانییە کۆنەکان. لێرەدا کاك شوانم مەبەستە. کاك شوان ئاماژە بۆ ئەو لاپەڕانەی کتێبی د. ڕشاد دەکات ، واتە ل٢٣-٢٥و دەڵێت: ((بەپێی تێپەڕبوونی قۆناغەکان ئاینی کورد لەپێشتر بوو لە عەرەب))و دەنووسێت: بۆ زێتر زانیاری بڕوانە (د. ڕەشاد میران: ڕەوشی ئاینیو نەتەویی لە کوردستان، ل٢٣-٢٥-بەتەنیا).

ئەمە یەکێکە لە گاڵتەجاڕییەکان. شوان سووکو باریك میدییەکانی گۆڕیوە بۆ وشەی (کورد)و ئاشورو بابلو ئەکەدی کرۆدتە وشەی (عەرەب)!! شتێکە مەگەر قوتابیانی ناوەندی لە ڕاپۆرتەکانیاندا بینووسن.

گاڵتەجاڕییەکی تر ئەوەیە کاك شوان قسەکەی سەرەوەی لە پەراوێزەکەدا نووسیوە، لە ناواخنەکەشو کاتیێ ئاماژە بۆ ئەو پەراوێزە دەکات دەڵێت: کورد لە ڕووی ئایینەوە لە ئاستێکی زۆر لە پێشتری عەرەبە موسڵمانەکاندا بوون (هەمان لاپەڕە). زانیشمان بەرەوپێش چوون کە د. ڕەشاد باسی کردووە بریتی بوو لە نزیکبوونەوە لە تەوحید. ئەوەش دەزانین کە ئەو شتەی لای عەرەبە موسڵمانەکان هەبوو (= تەوحید) لەوپەڕی پوختیدا بوو لەکاتێکدا زەردەشتیەتی سەردەمی فتووحات بەڵکو سەدان ساڵ پێش فتووحات پڕ ببوو لە شركو پوختییەکەی نەمابوو کەچی کاك شوان دەڵێت کورد زۆر لە عەرەبە موسڵمانەکان لەپێشتر بوو.

**چلو پێنج: (اصول اسماء المدن و المواقع العراقية/ ج١)ی (جەمال بابان)**

هەمان ئەو چاپە بێنە کە شوان نووسیویەتی دەبینی ئەو لاپەڕانەی شوان نووسیونی ڕاست نین. لە زانیارییەکانیش ئەم دووانەم هەڵبژاردووە:

١-ل٤٢ شوان: لەبارەی پردەکەی (زاخۆ)وە : ئێستا بە پردی عەبباسی دەناسرێت – جمال بابان، ل١٣٨.

لاپەڕە ١٣٨ شتی وای تێدا نییە. باسی شاری زاخۆش لە لاپەڕە ١٩٣- ١٩٤ دایەو لەو دوولاپەڕەیە تەنانەت ناوی پردەکەش نەهاتووە.

٢-ل٤٢ پەراوێز ** شوان: هەر زاخۆ: عەبباسیەکان پێیان دەوت (الحسينية) – جمال بابان، ل١٣٨-١٣٩.

---

[٧٢] کەچی شوان چەند لاپەڕەیەکی پێشتر ئاماژە بۆ ئەمە دەکات.

سەرەڕای هەڵەی لاپەڕەکان ئەم قسەیە نەوتراوە بەڵکو بابان قسەی دوو نووسەری (المرشد الی مواطن..) نەقڵ دەکات کە ئەوان وای بۆ دەچن زاخۆ لەو شوێنەدا دروست بووبێت کە شاری (الحسنية)ی تێدا بووەو کە زیاد لەیەك بولدانیی عەرەب باسیان کردووە.

کاك شوان نەك تەنها قسەکەی بە هەڵە نەقڵ کردووە بەڵکو ناوەکەشی بەهەڵە نووسیوە چونکە جەمال بابان لەجیاتی (الحسنية) – کە بەم جۆرە لە " المرشد "دا هاتووە – دەنووسێت (الحسينية)، شوان ڕێك ئەم (الحسينية)یەی نووسیوە هەرچەندە بۆ خۆی لە هەمان لاپەڕەدا شێوازە ڕاستەکەی نووسیوە، واتە (الحسنية).

**چل‌و شەش: (المرشد الى مواطن الاثار والحضارة)ی (طه باقر و فؤاد سفر)**

١–ل٤٢ پەراوێز ** شوان : لەبارەی (زاخۆ)وە: شوان دەڵێت: یاخود ناوی ئەو نەتەوەیە کە جوگرافی ناسی گریکی ئەسترابۆن (سترابۆن/ف.) بە سکۆدیۆس ناوی هێناوە.

شوان ناوی کتێبی (المرشد) دەنووسێت (الرحلة الثالثة ل٥٤–٥٥/ بە تەنیا) بەڵام گومان لەوەدا نییە شوان ئەم کتێبەی نەدیوەو ئەم زانیارییەی لەوانەیە لە کتێبی جەمال بابان وەرگرتبێت، بۆچی؟ چونکە:

١– (المرشد) دەڵێت سکوبودس Saccopodes (بە عەرەبی‌و لاتینی نووسراوە) بەڵام جەمال بابان دەنووسێت : سکودیوس‌و شوانیش دەنووسێت سکۆدیۆس.

٢–جەمال بابان بۆ ئەمە دەنووسێت: المرشد – ر٣– ص ٥٤–٥٥ شوانیش هەر ل٥٤–٥٥ دەنووسێت.ئەم دوو لاپەڕەیە باسی هەموو زاخۆیە بەڵام باسی سترابۆن وساکۆپۆدس لە لاپەڕە (٥٥)ـە.

شوان لە لیستی سەرچاوەکاندا گەشتی سێیەم نانووسێت بەڵکو تەنها گەشتی چوارەم‌و شەشەم. وەکو وتیشم ئەم زانیارییەی لەوانەیە لە کتێبەکەی پارێزەر جەمال بابانەوە وەرگرتبێت بەڵام تەنانەت گومانم لەوەش هەیە چونکە لە سەرەوەدا بینیمان کە زانیاریی هەڵە ئەو کتێبەشی گرتۆتەوە.

٢–ل٤٣ پەراوێزی * شوان : باعذرا ((ئێستا لە گوندەکانی شاری شێخان دەژمێردرێت کە مەڵبەندی ئێزیدیەکان))– الرحلة الثالثة، ل٤٢ (بەتەنیا).

گەشتەکە باسی شێخان ناکات‌و تەنانەت ناویشی ناهێنێت بەڵکو دەڵێت باعذرا ئێستا یەکێکە لە مەڵبەندە گرنگەکانی یەزیدییەکان‌و بارەگای سەرۆکەکەیانی تێدایە.

٣–ل٦٦ شوان : لەبارەی (جەلەولا)وە : ((چەند پاشماوەیەکی سەردەمی ساسانییەکانی لێیە)) – الرحلة السادسة، ل٥.

لە گەشتەکەدا وشەی (چەند) نەهاتووەو تەنیا یەك شوێنەوار باسکراوە ئەویش قەنتەرەیەك کە ساسانییەکان دروستیان کردبووو نزیك شارەکە بوو (نەك وەك شوان دەنووسێت : لێیە).

**چل‌و حەوت: (معجم البلدان)ی یاقووتی حەمەوی**

لە بەشی داهاتوودا نموونە لەسەر ئەمە دەبینین.

١– ل٢٢ شوان: قەڵای ماردین‌و ئەو شاخەی قەڵاکەی لەسەرە ((دەڕوانێتە سەر باکوورو باشوورو خۆرهەڵات‌و خۆرئاوا))– معجم البلدان، ج٥، ل٣٩. ئەو کتێبە شتی وای تێدا نییە. شوان دوو سەرچاوەی تری نووسیوە: قرة العين، ل١٨ و صورة الارض، ل٢٠٢. لەم دوانەش قسەکە تەنها لە دووەمیاندایە.

٢–ل٢٥٤ شوان: ((هەرچەندە سەرچاوەکان باس لەوە ناکەن کە دەڤەری شارەزوور لە دەسەڵاتی عەرەبە موسڵمانەکان هەڵگەڕابێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تا ماوەیەکی درەنگ نەیانتوانی بە تەواوی دەست بەسەر ئەو دەڤەرەدا بگرن‌و دەسەڵات‌و ئاینی خۆیانیان بەسەردا بسەپێنن))– معجم البلدان، ج٣ ، ل٣٧٥.

کاك شوان زۆر مەبەستێتی تێمانبگەیەنێت کە شارو ناوچە کوردستان لە دەسەڵاتی ئیسلامی هەڵگەڕابێتنەوە بگرە دوو جارو سێ جاریش ئەمەیان کردووە. لەم پێناوەشدا گرنگ نییە بە ئارەزووی خۆی‌و بێ پاراستنی ئەمانەتی زانستی زانیارییەکان وەربگرێت (ئەوە ئەگەر لەو زانیارییانە تێگەشتبێت)– بڕوانە بۆ نموونە کتێبی ژمارە (هەژدە) لەسەرەوەدا و

خاڵی (٢٠) لە بەشی داهاتوودا. لە حاڵەتی شارەزووریشدا شوان لەسەر هەمان بەزم دەڕوات بەڵام ئایا یاقووت خۆی چی وتووە؟ یاقووت (ل٣٧٥-٣٧٦) لەزاری (مسعر بن مهلهل) باسی کاتی خۆی دەکات کە خەڵکەکە یاخین‌و خراپەکاری‌و ڕاوڕووت دەکەن‌و بە هیچ جۆرێك نەیوتوە عەرەبە موسڵمانەکان نەیانتوانی((ئاینی خۆیانیان بەسەردا بسەپێنن)). تەنانەت یاقووت دەڵێت ئەمە کاتی خۆی بووەو ئێستا شارەزوور لەژێر فەرمانی موزەففەرولدین گۆکبوریی خاوەنی هەولێرەو زەبت کراوەو دەڵێت زاناو پیاوی گەورەی تێدایە. بەڵام هەروەها باسی کوردی کێوەکانی ئەو ناوچەیە دەکات کە ڕێبواران دەترسێنن‌و دزی دەکەن‌و ئەم شتە بەسەر کورد بەگشتی دادەبڕێنێت. ئیتر ئەم وەسفانەمان پێ خۆش بێت یان نا پێویستە زانیاری وەکو خۆی نەقڵ بکەین پاشان حوکمیان لەسەر بدەین بەڵام کاك شوان بەدرێژایی ماستەرنامەکە لە ڕەوتی زانستی لا دەدات‌و ماستەرنامەکەی کردۆتە کتێبی پەروەردەی نیشتمانی‌و لەم حاڵەتەماندا ئەوانەی یاقووت بە ئەهلی ڕاوڕووت وەسفیان دەکات ئەو دەیانکاتە پاڵەوانی نەتەوەیی.

## چل‌و هەشت: شتێکی خۆشی (المسالك والممالك)ی (ابن خرداذبة)

ل ٢٧٨-٢٧٩ شوان: شوان لیستی خەراجێك دەهێنێتەوەو دەڵێت ئەمە لە (ابن خرداذبة) وەرگیراوەو پاشان دەڵێت لیستی داهاتی خەراجی میسر شەش ملیۆن درهەمە کە بە بەرهەمترین ویلایەتی ئیسلام دەژمێردرێت بەڵام داهاتەکەی بە قەد شارێکی کوردە - المسالك والممالك، ل٢٥٠-٢٥١.

سەرەڕای هەڵەی هەندێ ژمارە" کتێبەکە باسی خەراجی میسرو ئەسکەندەرییە دەکات کە دوو ملیۆن‌و پێنج سەد هەزار دینارە (ل٢٥١)و بە حسابی پانزە درهەم بۆ یەك دینار (ل٢٤٩) بڕەکە دەکاتە ٣٧ ملیۆن و٥٠٠ هەزار درهەم ئیتر نازانم کاك شوان ئەو شەش ملیۆنەی لە کوێ هێناوە (کاك شوان بڕەکە بە نووسین و بە ژمارە دەنووسێت‌و هیچ گومانێك لەم بارەیەوە ناهێڵێت). شتە خۆشترەکە ئەوەیە کتێبەکە لەڕاستیدا دوو کتێبە: المسالك کە لە لاپەڕە ١٨٣دا تەواو دەبێت‌و لەوە بەدواوە هەڵبژاردەیە لە کتێبەکەی (قُدامة)" الخراج وصناعة الکتابة! واتە ئەو لیستە هی قودامەیە نەك (ابن خرداذبة)!

## چل‌و نۆ: (مقدمة)ی ئیبنو خەلدوون

شوان ناوی چاپی (١٩٩٩)ی ئەم کتێبە دەنووسێت منیش دوو چاپی کۆنترم دەستکەوتبوو: هی (دار العودة)ی لە بەیرووت‌و هی (المکتبة التجاریة الکبری) لە قاهیرە (هەردووکیان بێ مێژووی چاپن). دواتر چاپێکی ٢٠٠٢ م کەوتە بەرچاو. (مقدمة)ش تەنها یەك بەرگە کەچی کاك شوان لە دوو شوێنی کتێبەکەیدا (ئەوەی کەوتە بەرچاوم) ناوی (مقدمة) وەك سەرچاوە دەنووسێت‌و دەڵێت بەرگی ٢. لە یەکێکیاندا لاپەڕە ٦١٥ دەنووسێت واتە هەردوو بەرگەکە زیاد لە ١٢٠٠ لاپەڕەیە کە ئەمە ژمارەیەکی نەك زۆرە بەڵکو خەیاڵییە بۆ ئەو کتێبە.

یەکەم بەکارهێنانی (مقدمة) لاپەڕە (٢٧٨) ـەو بریتییە لە لیستی خەراجی هەندێ شارو ناوچەی کوردستانە (یەکێکیان نووسراوە : کور دیجلە واتە کوورەکانی دیجلە، کاك شوانیش نووسیویەتی : کورد دیجلە !). شوان هەڵەی لە ژمارەکان کردووەو لە هەموویان خراپتر ئەوەی شارەزوورە کە شوان ٦٧ ملیۆن درهەمی نووسیوە کە ڕاستەکەی شەش ملیۆن‌و حەوت سەد درهەمە (کاك شوان زەربی ١٠ ی کردووە). شوان لەسەر ئەم ئەساسە خەراجی ئەو شارەو ناوچەکانی دیکەی کۆکردۆتەوە کە کردوویەتییە ١٤٦ ملیۆن درهەم کە ئەمە هەڵەیە.

سەرەڕای ئەمە ناوی شوێنی دیکەی کوردستان هەیە لای ئیبنوخەلدوون بەڵام شوان نەینووسیون. ئەوانەی سەرەوە بەڵگەن کە شوان کتێبەکەی نەدیوە. شوان جارێکی تر ئاماژە بۆ کتێبەکە دەکات (وەك وتیشم لە دوو شوێندا بینیومە شوان ناوی کتێبەکەی وەك سەرچاوە نووسیوە)و بەپێی ئەو گوایە ئیبنوخەلدوون دەڵێت عومەر فەرمانی داوە سەرجەم کەلتووری زەردەشتی بسووتێنرێت‌و پەرەستگەکان بڕووخێنرێن (مقدمة ابن خلدون، مج ٢، ل٦١٥). وەکو وتیشم بەرگی ٢و لاپەڕە ٦١٥ واتای ئەوەیە هەردوو بەرگەکە زیاد لە ١٢٠٠ لاپەڕەن ئەمەش ژمارەیەکی خەیاڵییە چونکە کتێبەکە یەك بەرگەو لاپەڕەکانی ئەو یەك بەرگە ناگەنە ٦١٥ لاپەڕە مەگەر چاپی ٢٠٠٢. پاشان ئەگەر شتی وا لەو کتێبەدا هەبوایە

ڕۆژهەڵاتناسان دەمێك بوو بڵاویان دەکردەوە. شوانیش لە پەراوێزەکەدا سێ کتێبی تر دەنووسێت دوانیان کوردین "ئاشکراشە سەرچاوەی کوردی زۆر شتی لەم بابەتەیان تێدایەو ئەمانە فێرن ئەم جۆرە قسانە لە یەکتر وەربگرن هەتا ئەگەر قسەی سەرجادەش بن. سێیەمیشیان بەفارسییەو کراوەتە کوردیو لەوە ناچێت حاڵی باشتر بێت. بەهەرحاڵ بۆ خۆم ئەو شتەم لە (المقدمة)دا نەبینی. یەکێك لەو سێ کتێبەی بەپاڵ (المقدمة) نووسراون ئەوەی د.جەمال نەبەزە" کوردی سەرگەردانو برا موسڵمانەکانیان ، ل٢٤. شتی واش لەو لاپەڕەیەدا نییەو چەندیش گەڕام لە شوێنی تری کتێبەکە نەمدۆزییەوە.سەرچاوەی دووەم ئەوەی (ڕەفیق سابیر)ە" بەرەو مێژوو، ل٢٨. هەقە ئەمەیان ناوی(بەرەو ئەفسانە)ی لێ بنرێت چونکە تێکەڵەیە لە سۆزێکی گەرمو خەیاڵێکی خۆش. ناوبراو باسی (مقدمة) دەکات بێ ئەوەی پێمان بڵێت کام چاپو کام لاپەڕەیە کەچی هێشتا شوان پێی زانستییە قسەکەی وەك سەرچاوە بنووسێت![٧٣].سێیەمیان هی (هاشم رضی)یە، زەردەشتو ئامۆژگارییەکانی،ل ١٢١ .ئەم لاپەڕەیە لە ڕاستیدا تەنها ئاماژەیەو لێرەدا پێمان وتراوە تەماشای ل١٠٢ بکەین، لەوێشدا ناوی سەرچاوەیەکی فارسی نووسراوەو وتراوە لە نووسراوێکی ئیبنوخەلدووندا ئەوە هاتووە! کاك شوان ئاوا مامەڵەی زانستی لەگەڵ سەرچاوەکاندا دەکات.

**پەنجا: (الفتح الاسلامي للعراق والجزيرة)ی (المقدم عبدالحميد حسين)**

١–ل١٤٩ شوان: یەزدیگورد: داوای لە والییەکانی هەر یەك لە هەمەدانو ڕەیو هەرێمی چیاو ئازەربیجانو شێروانو ئەهواز –سوسنیا– (ڕاستەکەی سوسیانا/ف.) کرد لە جەلەولا کۆببنەوە –الفتح الاسلامی، ل١١٥.

ئەو لاپەڕەیە (هی هەمان چاپ) باس لە ڕۆژی (عِماس)ـە کە یەکێکە لە ڕۆژانی شەڕی قادسیەیەو پێش شەڕی جەلەولا بوو. باسی جەلەولاش لە لاپەرە ١٥٨ بەدواوەیەو ئەوەی تێدا نییە کە شوان باسی دەکات.

٢– ل١٥٥ شوان: شوان دەڵێت بڕیاری گرتنی حولوان قابیلی گۆڕان نەبوو چونکە مانەوەی حولوان واتای بوونی بنکەیەکی سەربازیو کۆمەك وسازدانەوەی لەشکری ساسانیو پەلاماردانی عەرەبە موسڵمانەکانە – الفتح الاسلامی، ل١٥٨.

یەك وشە لەوەی سەرەوە لەو لاپەڕەیەدا نییە. لاپەڕەکە باسی ئامادەکاری بۆ شەڕی جەلەولا دەکاتو کە ئەم شەڕە پێش گرتنی حولوان بوو. لە لاپەڕە ١٦٢ ی کتێبەکە باسی حولوان هەیەو وا لەباسەکەی نووسەر تێدەگەی حولوان گیرابێتو نووسەر دەڵێت (ئەلقەعقاع) عەرەبو حەمرای لە حولوان دانا بۆ ڕێگەگرتن لە یەخەپێگرتنی موحتەمەل لەلایەن فارسەکانەوە. واتە لێرەشدا کە باسی حولوان کراوە ئەو شتە نەوتراوە کە شوان نووسیویەتی.

٣– ل١٥٧ شوان : لەبارەی (الحمراء) شوان قسەی نووسەر دەهێنێتەوە کە ئەمانە کوردەکانی ناو لەشکری ساسانی بوون کە بە دیل گیرابوونو لەبەرامبەر ئازادکردنیان ببوونە موسڵمانو جەنگاوەر لەناو لەشکری عەرەبە موسڵمانەکان – الفتح الاسلامی، ل١٥٨،پەراوێزا (بەتەنیا).

ئەمە دەچێتە پاڵ ئەوانەی سەرەوە بۆ سەلماندنی ئەوەی شوان ئەم کتێبەی نەدیوە دەنا باسی (الحمراء) لە لاپەڕە ١٦٢ پەراوێز (١٠)دایە (دووبارەی دەکەمەوە ئەمە هەمان چاپە). پاشان نووسەر شتی وای نەنووسیوەو نەیوتووە ئەمانە بەرامبەر ئازادکردنیان ببووژە موسڵمانو جەنگاوەر لە لەشکری ئیسلامی بەڵکو نووسەر ئەوە دەڵێت کە ئەمانە سەربازی

---

[٧٣] ڕەفیق سابیر هەروەها باسی سووتاندنی کتێبخانەی ئەسکەندەرییە لەلایەن موسڵمانان دەکات کە بۆ سەدەیەك دەچێت مێژوونووسانی ڕۆژئاوا باوەڕیان پێی نەماوە. وڵ دیورانت دەیان ساڵ بەر لەئێستا وتوویەتی زۆربەیمێژوونووسان ئەمە بەخورافەت دەزانن" قصة الحضارة، ج ١٣، ل٢٦٣. بەڵام نووسەری کوردی زۆرمان هەیە هێشتا لە خورافەتدا دەژین. ڕەفیق سابیر لە کتێبە لماوییەکەیدا، ئیمپراتۆریای لم (چاپی٢،٢٠٠٢، ل١٠٥) ئەو شتە دەنووسێتەوە بەڵام ئەم جارە زانیارییەکان دەنووسێت" دار العودة،بیروت، ١٩٨١، ل٢٨٥–٢٨٦ (نووسراوە لا ٢٨٦–٢٨٥) هەروەها ناو کتێبێکی فارسی دەنووسێت. ئەم کتێبە فارسییە لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوای ئەوسا دەرچووەو هەروەکو ئەو کتێبە لماوییەیە. بۆ (مقدمة)ش ل٢٨٥–٢٨٦ ی چاپی (دار العودة)ی لای خۆمو ژمارەیەك لاپەڕە لە پێشو لە دواو ژمارەیەکی زۆری لاپەڕەی شوێنی دیکەم تەماشا کرد بێ ئەوەی هیچم دەستکەوێت.

فارس بوون کە ببوونە موسڵمان‌و چوونە پاڵ لەشکری عەرەب لە شەڕی قادسیەو ئەمانە کورد بوون بۆیە عەرەب پێیان وتوون (حمراءُ دیلم) چونکە دواتر دەیلم سەرۆکیان بوو لە کووفەدا[٧٤].

وەکو وتم ئەم هەڵانە نیشانەی ئەوەن شوان کتێبەکەی نەدیوە، خۆ ئەگەر دیبێتی تاوانەکەی گەورەترە چونکە لە حاڵەتی یەکەمدا ئەمانەتی زانستیی نەپاراستووە بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا جگە لە نەپاراستنی ئەمانەتی زانستی ڕاستییەکانی هەڵگێڕاوەتەوە. شوان هەر لە سەرەتاوە بڕیاری داوە کورد هاوکاریی دەوڵەتی ساسانی‌و بیزەنتی دژی ((عەرەبە موسڵمانەکان))ی کردبێت‌و ئەگەر ڕاستییەکی پێچەوانەی زانیبێت لێی بێدەنگ بووە. شوان دەڵێت قوباد فەرماندەی ئەم سوورانە بوو (ل١٥٧) بەڵام ئەوە ناڵێت (ئەگەر زانیبێتی) کە ئەلقەعقاع کە حولوانی جێهێشت ئەم (قوباذ)ەی کردە فەرمانڕەوای شارەکە. پێویستە کورد لەو ماستەرنامەیەدا وەکو هەڵگری قەزیەی ساسانی‌و بیزەنتییەکان پیشان بدرایە.

## پەنجاو یەك:(الخراج و صناعة الكتابة) ی (قُدامة بن جعفر)

نموونە زۆرە لە هەڵەکانی شوان سەبارەت بەم کتێبە. لەم بەشەدا ئەم نموونەیە وەردەگرم:

ل٢٧٤ شوان: شوان دەڵێت:عەرەبە موسڵمانەکان شت نەما نەیپشکنن بۆ ئەوەی باجی لەسەر دابنێن. پاشان باسی باج خستنەسەر خۆراك‌و مەڕوماڵات‌و مەی‌و تەنانەت ئازووقەی سەربازەکانیان‌و مووچەی مووچەخۆرەکانیش – الخراج و صناعة الكتابة، ل٢٦٤.

ئەم قسەیە حکومەتی هەرێمان دەخاتەوە یاد کە شوان‌و دکتۆرەکان لە موناقەشەکەدا سوپاسیان کردبوو. هەرچەندیشە لە مێژوودا زۆر بینراوە باجی زۆر بسەپێنرێن بەڵام ئەو لاپەڕەیەی شوان نووسیویەتی ئەو قسەیە یان تەنانەت بەشێکی ئەو قسەیەی تێدا نییە بەڵکو باسەکە لەبارەی فەتحی مەککەوەیە. قسەکە هەروەها نە لەلاپەڕە ٢٤٦و نە لە ٣٤٦و نە لە ٣٦٤ دا هەیە.

## پەنجاو دوو: (صورة الارض)ی (ابن حوقل)

١–ل٢٢ شوان: ماردین :((سەرچاوەی ئاوی کانی‌و قەنەواتیشی زۆرە)) – صورة الارض، ل٢٠٢(بە تەنیا).

نەخێر داماوانە بێ ئاوبوون. ئیبنو حەوقەل دەنووسێت ئاو لە کانییەوە دەهێنن کە بە قەنات ڕاکێشراون‌و ئێستا حەوزو گۆمیان دروستکردووە بۆ کۆکردنەوەی ئاوی باران. شوان کتێبەکەی بەتەنیا نووسیوە بەڵام باشترە بەقسەکەی (یاقووت) تەئکید لەوە بکەین. یاقووت دەڵێت کانییان کەمەو ئاوی خواردنەوەیان لە حەوزی ناو ماڵەکانیان وەردەگرن (معجم البلدان، ج٥، ل٣٩).

## پەنجاو سێ: دکتۆرانامەکەی دکتۆر حسام الدین باشترین شتە ببێتە کۆتایی ئەم بەشە

١– ل٨٢ پ. * شوان: ((سەلەماس (سەڵماس/ ف.).. ئێستا ناوی گۆڕدراوە، سەرەتا کرا بە (کُهنە شهر–واتە– کۆنە شار) دواتر گۆڕدرا بۆ شاهپور، بۆ زێتر بڕوانە د. حسام الدین(..): اذربیجان، ل٧٧))، سەرچاوەی تریشی مێژووی کوردو کوردستانی (مەردۆخی)یە.

د. حسام الدین دەڵێت: لەم ڕۆژگارەماندا شارێك نییە بەناوی (سلماس) هەبێت بەڵام ئەمڕۆ شارەکە بریتییە لەو گوندەی بەناوی کُهنە شهر (واتە شاری کۆن) ناسراوە، یەکێکیش لە بەشەکانی هەرێمی ئازەربایجان بە (سلماس) ناونرابوو بەڵام ناوەکە گۆڕدرا بۆ شاهپور.

واتا د.حوسام دەڵێت شاری سەڵماس نەماوەو ئێستا گوندی کوهنە شەهر لەجێگایدا هەیە، بەڵام شوان قسەکە وا لێ دەکات: ناوی سەڵماس کراوەتە کوهنە شەهر. ئینجا د.حوسام باسی ناوچەیەکی ئازەربایجان دەکات کە ناویان نابوو سەڵماس‌و دواتر ناوەکەی کرا بە شاهپور کەچی شوان هەر باسی شاری سەڵماس دەکات‌و دەڵێت ناوی کراوە بە شاهپور.

---

[٧٤] ئەمە ڕایەکە، سەبارەت بە بۆچوونی تر لەبارەیانەوە بڕوانە فتوح البلدان، ل٢٧٩.

٢–ل٢٥٦ شوان: لەمیانەی باسی بەعەرەبکردن و هۆکاری ئابووری: ((چونکە عەرەبەکان سەرباری ئەوەی دەسەڵاتدار بوون، هاوکات خۆیان کاریان نەدەکرد بەڵکو سەرپەرشتیی کۆکردنەوەی داهاتی دەوڵەتی خەلافەتیان دەکرد)) — د. حسام، ل٨٨.

شوان دواتر لەباسی ئازەربایجان ئەمە دەڵێتەوە. بۆ سەرچاوەی دووەم کە (فتوح البلدان، ل٣٢٥) ـە بڕوانە ژمارە(١٦) لە بەشی داهاتووداو ئەو کاتە دەزانی قسەکەی شوان ((کۆکردنەوەی داهات))چەندی ڕاستە. سەبارەت بەوەی د.حوسامیش دکتۆر خۆخەریك نەکردن بەو کارانە دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی موسڵمانەکان ئامادە بن بۆ جەنگ وپاراستنی ئاسایش و بەرگری کردن لە وجوودی ئیسلامی لە هەرێمەکەداو باس لە کۆکردنەوەی داهات ناکات. شوان وا مامەڵە لەگەڵ کتێبی مامۆستاکەی خۆی دەکات ئیتر خوا یارمەتیی ئیبنو حەوقەل و هاوەڵانی بدات.

* * * * * * *

ئەوانەی سەرەوە چەند سەرچاوەیەك بوون، لەبەر ئەوەشی ویستم زووتر ئەم ڕەخنەیەم تەواو بکەم سەرچاوەی ترم جێهێشت. زۆریشم حەز دەکرد بەدوای ئەو سەرچاوە ئینگلیزییانە بچووما یە کە شوان گوایە بەکاری هێناون چونکە کاك شوان کە عەرەبییەکەی ئەو باشە نەبێت چۆن چاوەڕێ بکەین سەرچاوەی ئینگلیزی بەکار بهێنێت؟ ئەگەر ئەوانەشی دیبێت چۆن بەتەما بین بەو دەردەی سەرچاوە عەرەبییەکان نەیبردبن؟ ئەمانە بۆ کەسێك جێدەهێڵم ئەو سەرچاوانەی دەست بکەوێت[*]. زۆرم بۆ ڕەخنەگرانی تر جێهێشتووە.

## ٢-پەراوێزەکان بە کاملی

ئەم بەشە پێش بەشەکەی سەرەوە نووسراوەتەوە ودواتر بۆی زیادکراوەو ویستبووم بۆ هەموو ڕەخنەکان هەمان کار بکەم، واتە زانیارییەکەی شوان بهێنم و یەك بەیەکی سەرچاوەکان تەماشا بکەم. وەکو وتیشم خەریك بوون بەکتێبەکە کاتێکی باشی دەوێت بۆیە بەشێکی کتێبەکەم وەرگرت و باقییەکەی تریم بۆ کەسانی‌تر جێهێشت. لەبەر کاتەکەش بوو کەبەشی پێشووی ئەم ڕەخنەیەم وا لێکردووە واتە سەرچاوەکە بەتەنیا وەربگرم. هەرچەندە ئەو شێوە ڕەخنەیە بەسە بۆ سەلماندنی پەیڕەوی نەکردنی ئەمانەت و مەنهەجی زانستی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بەشەم هێشتەوە تا بزانرێت کە مەسەلەکە تەنها ئەوە نییە زانیارییەکە لەکتێبێکدا نییە بەڵام لەوانەیە لەوانەی تریشدا نەبێت.

١-**کورد لە هەرێمی فارسدا:** شوان دەڵێت:کورد لەهەندێ لەم ئوستانانە (مەبەستی ئەوانەی هەرێمی فارسی) نیشتەجێ بووە بەتایبەتی لەئوستانەکانی ئەرگان و شاپور (ل٧٤).

ئەمانەش سەرچاوەکانی کاك شوانن:ابن خرداذبة:المسالك والممالك، ل٤٧" مێژووی تەبەری، ج٤،ل٦٨" صورة الارض، ل٤٠، ٢٤٠، ٢٤١"احسن التقاسيم، ل٤٤٦.

تەبەری یەك وشە لەمە ناڵێت و تەنانەت ناوی (ئەرەجان)و (سابوور)یش ناهێنێت و تەنها ناوی (سابور) دێت کەناوی کەسێکە نەك شوێن .(احسن التقاسيم)یش هیچ لەقسەکەی شوان لەبارەی کوردەوە ناڵێت و تەنها بەجیا ناوی سابوور و ئەرەجان دەهێنێت. دوو کتێبەکەی تر باسەکەیان وەکو یەکە. ئەمان باسی هەرێمی فارس و (کوورە)کانی دەکەن و لەکۆتاییدا باسی کوورەی سابوورو دوای ئەو کوورەی ئەرەجان دەکەن ئینجا باس دێتە سەر ناوچەکانی (زموم = محلات)ی کورد لەفارسدا.. واتە باس لە سابوورو ئەرەجان نەکراوە کە کورد بە تایبەتی تێیدا ژیابن.(صورة الارض،

---

[*] ئەمە قسەی چاپی یەکەم، بڕوانە پاشکۆ بۆ سێ سەرچاوەی ئینگلیزی و شتی سەیر دەبینی

ل٢٣٨–٢٣٩ نەك ل٢٤٠، ٢٤١ هەروەها لاپەڕە ٤٠ کە شوان نووسیویەتی باسی بەشێکی جەزیرەی عەرەب دەکات. ئیبنو حەوقەل لەجیاتی ئەررەجان دنووسێت: الرجان).

**٢–شوان باسی شاری (تەووج)** لە هەرێمی فارس دەکات کەشارێکی کوردە و دەڵێت ((لە کاتی فتووحاتی لەشکری عەرەبە موسڵمانەکان ناوی هاتووەو کورد شەڕی گەورەی لەبەرامبەردا کردوون)) (ل٧٥ شوان). سەرچاوەش:

فتوح البلدان، ل٣٧٩، تاريخ الرسل والملوك، بەرگی ٥، ل٤٢، الخراج وصناعة الكتابة، ل٣٨٧.

کەچی هیچ لەمانە ئەم قسەیە ناکەنو هەرسێکیان ئەم شارە سەر بەخاکی (أردشيرخرة) دادەنێنو تاکە وشەیەك لەسەر کوردو شەڕی کوردان نەهاتووە.

٣–((**پاش گیرانی مهرەگان:** (السائب بن الاقرع) چووە سەر شاری (الصيمرة) کە کۆشکی هورمزیانی لێبوو))–(شوان،ل١٦٢)

سەرچاوە: كتاب الخراج، ل٦٠، محمود شاكر: التاريخ الاسلامی، مج ٢/ ج٨١/١.

کتێبی یەکەمیان (کەچاپێکی ترە) هیچی وای تێدا نییە. تەماشای هەروەها پێڕستی ناوەکان بکە. لەو چاپەی کتێبی دووەمیش کە لەبەردەستمدابوو هیچ باسێك لەم بابەتە نییە (ناوی سەرچاوەکەو ساڵی چاپی .. تاد لە لیستی سەرچاوەکاندا نەنووسراوە بەڵام سەیری باسی فتووحاتی ناو ئەو چاپەی کتێبەکەم کردو هیچی تیا نەبوو لەسەر ئەمە).

**٤–یەکسەر دوای ئەوەش:**((ئەویش بەهەمان شێوە صوڵحیان کرد بەرامبەر دانی باجی جزیەو خەراج بۆ عەرەبە موسڵمانەکانو سائب توانی هەموو ناوچەی (الصيمرة) بگرێت))– (ل١٦٣).

سەرچاوە: الاخبار الطوال، ل١٢٣، الخراج و صناعة الكتابة، ل٣٧٣.

کتێبی یەکەم ئەمە قسەکەیەتی: (السائب) گەشتە کۆشکی هورموزان، خاوەنی (تستر)، وڵاتی ئەویش (الصيمرة) بوو.

کتێبی دووەمیش (ل٣٧٢ نەك ٣٧٣) دەڵێت: ئەبو مووسا (السائب)ی نارد بۆ (الصيمرة) شاری (مهرجانقذق)[٧٥] ئەویش بە صوڵح گرتی (..)و هەر بەهەمان صوڵحی هەموو ناوچەی (مهرجانقذق)ی گرت.

**٥– سەرلەشکری ساسانی (ئاذین) بەدیل دەگیرێت:** شوان دەڵێت : داوای لێ کرا موسڵمان ببێ بەڵام ئەو داواکەی ڕەت کردەوە، ئەوە بوو لەسەریان داو کوشتیان (شوان، ل١٥٩).

سەرچاوە: مێژووی تەبەری، ج٣/ ل٢٢٢، الكامل في التاريخ، ج٢/ ل١٤٨ (چاپی لای خۆم ل٣٦٦)، البداية والنهاية، مج٤/ل٧٣ (چاپی لای خۆم : ل٧٢).

ئەمانە هیچیان ناڵێن داوای لێ کرا ببێتە موسڵمان.

**٦–شوان باسی ناوچەی ئەهواز دەکات** کەدەوڵەمەند بووو بۆیە کێشە دروست بوو و سەرەتا کەوتە نێوان ئۆردووی کووفەو ئۆردووی بەسرە لەسەر غەنائمو دەستکەوتو کار گەشتە ئەوەی خەلیفە عومەر بێتە ناو کێشەکەو چارەسەری بکات (شوان،ل ١٨٠).

سەرچاوە: تاريخ الرسل والملوك ج٤/ل٢٤٧، الخراج وصناعة الكتابة، ل٣٤، الكامل في التاريخ، ج٢/ ل١٦ (ج٣، ل١٥ چاپی لای خۆم) ، تاريخ ابن خلدون مج٢، ج٢/ ل١١٢.

کەچی لای تەبەری ئەو موسڵمانانەی لەبەسرەدا نیشتەجێ بوون شکاتی هەژارییان لای عومەر کرد کە ئەوان لەچاو کووفە هەژارترن. سەرچاوەی دووەمیش هیچ لەبارەی ئەمەوە ناڵێت، هەمان شتیش بۆ سەرچاوەی چوارەم. سێیەمیشیان باس لە شکاتی خەڵکی بەسرەیە کە ژمارەیان زیادی کردووەو خەراجەکە بەشی نەدەکردنو چارەسەری ئەمە لەلایەن عومەرەوە..

---

[٧٥] بەم شێوەیە لەسەرچاوەکەدا هاتووە واتە: (الصيمرة) شاری (مهرجانقذق).

**٧-لەبارەی ڕێکەوتنی موسڵمانان و هورموزان** دەڵێت ((بەڵام بەهۆی دۆخی سیاسیی و بەهەند وەرنەگرتن و نەناساندنی هورمزیان و دەسەڵاتەکەی بۆیە بەم شێوەیە ڕاگەیاندراوەو لەبایەخی ئەم ڕێککەوتنە کەم کراوەتەوەو کراوە بەڕێککەوتنێکی ناوخۆیی)) – (ل١٨٠).

لەپەراوێزیشدا دەنووسێت: چونکە بڕیاری ڕاستەوخۆی خەلیفەی لەگەڵدا نەبووە بۆیە بەڕێککەوتنێکی ناوخۆیی دەناسرێت (تاریخ الرسل والملوك، ج٤/ ل٢٢٣-٢٢٤، البداية والنهاية مج٤/ج٧/ل٨٠-١٠١)

تەبەریش یەك وشە لەبارەی ئەمەوە ناڵێت ئەو دوو لاپەڕەیەش باس لەوە دەکەن کەموسڵمانان کووفەیان دروست کرد. بۆئەوەی (ابن كثير) یش شوان (٢٢) لاپەڕەمان بۆ دەژمێرێت (ل٨٠-١٠١) لەکاتێکدا باسی شەڕی ئەهواز لاپەڕەیەکە لەو کتێبەدا!

((ئەو شێوەیە))ی شوان مەبەستێتی ئەوەیە هورموزان توانایەکی سەربازیی و سیاسی بەهێزی هەبووەو عەرەبەکانی ناچار کرد دان بەدەسەڵاتیدا بنێن و ئەمە شتێکی تازە بوو لەسیاسەتی عومەر چونکە عوتبە کوڕی غەزوان دوای ڕێکەوتنەکە عومەری ئاگادارکردەوەو ئەو ڕێکەوتنەکەی پەسەند کرد (ل١٧٩-١٨٠) بەڵام چونکە دوای ڕێکەوتنەکە عومەر ئاگادارکراوەتەوە لەکاتێکدا نەدەبوو هیچ والیەك بێ فەرمانی ئەو لەخۆیەوە کاربکات بۆیە دەبێت خەلیفە عومەر خۆی ئاگاداری ئەم ڕێکەوتنە بووبێت و خۆی بڕیاری لەسەر دابێت بەڵام بەهۆی دۆخی سیاسی بەهەند وەرنەگرتن و ناساندنی هورموزیان و دەسەڵاتەکەی بۆیەم بەم شێوەیە ڕاگەیاندراوەو لەبایەخی ئەم ڕێکەوتنە کەم کراوەتەوەو کراوە بەڕێککەوتنێکی ناوخۆیی (ل١٨٠) ..پێچوپەناکردنمان لەمە باشتر دەست ناکەوێت !

جارێ وتمان (ڕێککەوتنەکە بایەخی پێ نەدراوە) لەهیچ لەو سەرچاوانە نییە کە ناویان دەبات واتە ئەم قسەیە دروستکراوی خۆیەتی. پاشان خەیاڵێکی تری دەخاتە پاڵ کە بێ ئاگاداری عومەر کەس بۆی نەبوو هەڵسوکەوت بکات و کە مێژووی فتووحات دژ بەمە چەندین نموونەی تێدایەو کەچۆن سەرلەشکرەکان ڕێکەوتنیان لەگەڵ شارو ناوچەکاندا ساز دەدا.

پاشان هیچ مەنتق لەقسەکانی سەرەوەدا نییەو لە پێچوپەناکردن بەدەر نین دەنا مانای چییە بڵێین عومەر پێشتر ئاگای لەڕێککەوتنەکە بوو بەڵام وا پیشاندراوە کەدواتر ئاگای لێ بووەو مەبەست لەوە کەم کردنی بایەخی هورموزان و ڕێککەوتنەکە. دواتر کێ ئەم شێوەیەی بەڕێککەوتنەکە بەخشی؟ غەیری مێژوونووسە موسڵمانەکانمان نییە بەڵام ئەمانە چیان دەستکەوتوە باسیان کردووە، بەتایبەتی تەبەری، بێگوێدانە شتی زۆر گەورەترو خراپتر لەوەی شوان باسی دەکات واتە (دانانی بایەخێکی کەم بۆ ڕێککەوتنەکە).

مەبەستی کاك شوانیش تەنها ئەوەیە هورموزان وەکو پاڵەوان پیشان بدرێت بەڵام عومەر ویستویەتی بچووکی بکاتەوە، گرنگیش نییە هورموزان سەرکردەیەکی ئەو دەوڵەتە ساسانییە بوو کە کوردستانی لە ژێردەستدا بوو یان مەبەستەکەی تەنها بەرژەوەندیی خۆی بوو گرنگ ئەوەیە دژی لەشکری ئیسلامی وەستابوو. بە هەر حاڵ هورموزان دوای تەسلیم بوونی دەبێتە موسڵمان و لە مەدینە نیشتەجێ دەبێت .

**٨- لە بارەی شاری (توستەر)ەوە:** شوان دەڵێت لە سەردەمی عومەردا دوو جار لە دژی دەسەڵاتی عەرەبە موسڵمانەکان ڕاپەڕی و هەردوو جار ڕاپەڕینەکە بە فەرماندەیی (ابو موسى الاشعري) دامرکێنرایەوە دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆریان لێکوشتن و ژن و منداڵەکانیان بەتاڵان بردن(شوان ل٢٤٢).

سەرچاوە: فتوح البلدان ل٣٧٤-٣٧٥و الخراج وصناعة الكتابة ، ل٣٨٦-٣٨٧ .

سەرچاوەی یەکەم (ل٣٧٣-٣٧٤) روایەتێکی دووروودرێژ دەهێنێتەوەو ئەوەی تیادا هاتووە کە شارەکە دوای شەڕێکی قورس گیرا، ڕیوایەتێکی کورتیشی هێناوە کە شارەکە بە صولح گیرابووو دوایی هەڵگەڕایەوە. سەرچاوەی دووەمیش (ل٣٨٥) ڕیوایەتە درێژەکە بە کورتی دەهێنێتەوەو ئەوەی تێدا هاتووە کە ئەوەی ئەمانی نەبووە کوژرا. ئیتر هیچیان نە باسی دوو جار هەڵگەڕانەوەو نە بەتاڵان بردنی ژن و منداڵیان نەکردووە.

٩-**شوان لەبارەی گوایە بەعەرەبکردنی کوردستانەوە** شتی وا دەڵێت کە سەرچاوەکان نەیانوتووە. شوان دەڵێت کە لەگەڵ گیرانی شاری مووسڵ چەند هۆزێکی عەرەبی (بنو تغلب واياد ونمير) لەم شارە نیشتەجێ بوون (ل٢٦٠).

سەرچاوە: مێژووی تەبەری، ج٤، ل٢٢٠" الكامل في التاريخ، ج٢، ل١٣٦، تاريخ ابن خلدون، مج٢، ج٢، ل١٠٠" البداية و النهاية، مج٣،ج٧،ل٨٧.

جارێ (نمير) نییە کە شوان چەند جارێك بەم شێوەیە ناوی هێناوە بەڵکو (النمر)ە دواتر ئەو سەرچاوانەی ناوی بردوون وا ناڵێن بەڵکو دەڵێن کە ئەو سێ هۆزە لەگەڵ ڕۆمەکان‌و سەرکردەیەك بەناوی (الانطاق) پێکەوە دژی لەشکری موسڵمانان شەڕیان کرد بەڵام موسڵمانان لەگەڵ ئەو سێ هۆزە ڕێککەوتن‌و ئەمان موسڵمان بوون‌و لەشەڕەکەدا کۆمەکی لەشکری موسڵمانانیان کرد ئیتر ئەم نیشتەجێ کردنەی سێ هۆزەکەی لە کوێوە هێناوە؟!

١٠-**هەر لەبارەی بەعەرەبکردن شوان دەڵێت:** ((هاوشان لەگەڵ پرۆسەی لەشکرکێشی... دەوڵەتی خەلافەتی عەرەبی ئیسلامی سیاسەتی بەعەرەبکردنی پیادە دەکرد...)) پاشان مەرامەکانی ئەم سیاسەتە دەژمێرێت کە یەکێکیان: ((هۆزە عەرەبە نیشتەجێ بووەکان وەك ئۆردوێکی سەربازی (حامية عسكرية) هەمیشەیی لە شارەکان دادەنران، چونکە دەسەڵاتی ناوەند لەوە دەترسان شارە داگیرکراوەکان ڕاپەڕن‌و دەسەڵاتی عەرەبە موسڵمانەکان وەدەرنێن))- شوان، ل٢٥٥.

سەرچاوە: مێژووی تەبەری، ج٤، ل٢٢٣" فتوح البلدان، ل١٠٩" الكامل في التاريخ، ج٢، ل١٤٩، تاريخ ابن خلدون، مج٢، ج٢، ل١١٠.

کتێبەکان یەك وشە لەبارەی ترسی دەسەڵات لە ڕاپەڕین ناڵێن‌و ئەمە قسەی شوان خۆیەتی ئەگینا سەرچاوەی یەکەم‌و سێیەم‌و چوارەم باسی دروستکردنی کووفە دەکەن کە ئەمە شارێکی نوێ بوو نەك شارێك بێت پێشتر هەبووبێت‌و موسڵمانان خرابێتنە ناوی. سەرچاوەی دووەمیش باسی کاتی ڕیددەی عەرەب دەکات نەك فتووحات. بەهەر حاڵ ڕەنگە (ل١٠٩) هەڵەی چاپ بێت‌و ڕاستەکەی لاپەڕە ٢٠٩ بێت کە باسی ئەوەی تێدا هەیە مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك ٢٤ هەزار کەسی خەڵکی شامی لەناو شاری (الباب – دەڵێت: الباب والابواب) کە لە ئەرمینیادایە نیشتەجێ کرد، ئەمەش لە سەردەمی ئومەویدا بوو نەك کاتی فتووحاتی یەکەم. شایەنی وتنە عومەر فەرمانی دابوو سەربازەکان دوور لە شارو گوندەکان نیشتەجێ بکرێن. ئەمە لە لاپەڕە (٣١٥)ی کتێبی (الخراج‌و صناعة الكتابة)دا هاتووەو شوان چەند جارێك ئاماژە بۆ ئەو لاپەڕەیە دەکات کەچی ئەو ڕاستییە ناڵێت ، بگرە باسی هاندانی دەسەڵاتی خیلافەت لەمەسەلەی نیشتەجێبوون ((لە شارو شارۆچکە ناعەرەبییەکان‌و بە تایبەتی شوێنە دوورەکان)) دەکات‌و دەڵێت ئەم سیاسەتە هەر لەسەردەمی عومەرەوە دەستی پێ کردو دوای ئەویش درێژەی کێشا (ل٢٥٨ شوان). فەرمانی عومەر ئەوە بوو کە زانیمان کەچی شوان وا لێی تێ دەگات.

١١- **بەعەرەبکردنی ناوەکان:** شوان دەڵێت عەرەبە موسڵمانەکان ناوی شاری (نەوکرد) یان گۆڕی بۆ ناوێکی عەرەبی ئەویش (الحديثة).بڕوانە (ل٢٦٠) وەکو سەرچاوەش کتێبەکەی یاقووتی حەمەوی" معجم البلدان (ج٢/ل٢٣٠-٢٣٥) دەهێنێت .ئەم سەرچاوەیەش باسی ئەوە دەکات کە شارەکە وێران بووو مەڕوان کوڕی محمد کوڕی مەڕوان (ی ئومەوی) ئاوەدانی کردەوەو پرسی ناوی چییە ئەوانیش پێیان وت، ئەویش وتی ناوی بنێن (الحديثة).

چیرۆکێکی تری ناونانەکە دەیگێڕێتەوە بۆ کاتی حەججاج، واتە لەهەموو حاڵەتێکدا ئەمە زۆر دوای گرتنی شارەکە بوو.خۆش ئەوەیە شوان ئەم ژمارەی لاپەڕانە دەنووسێت:(٢٣٠-٢٣٥) لەکاتێکدا باسەکە لەلاپەڕە (٢٣٠)دایە. وا بزانم ئەگەر شوان کتێبەکەی دیبێ ئەوا بەوە لێی تێکچووە کە یاقووت باسی چەند شارێك بەناوی (الحديثة) دەکات لە لاپەڕە ٢٣٠-٢٣٢.

١٢-**لەبارەی شاری (حولوان) یشەوە دەڵێت:** هەر لە دوای گرتنی شارەکە نەوەکانی (جرير بن عبدالله البجلي) نیشتەجێ بوون‌و تا سەدەی سێیەمی کۆچی/ نۆیەمی زاینی مانەوە (ل٢٦٢).

سەرچاوەش: فتوح البلدان ل٢٩٩، الخراج وصناعة الكتابة، ل٣٧٠.

سەرچاوەی دووەم هیچی وای تێدا نییەو تەنها باسی حولوان هاتووە، سەرچاوەی یەکەمیش ناڵێت ((تا سەدەی سێیەم مانەوە)) ، ئەی کاك شوان ئەمەی لەکوێ هێناوە؟ کاك شوان بینیویەتی سەرچاوەی دووەم لەنووسینی (البلاذري) یەو ئەمیان لەسەدەی سێیەمی کۆچیدا ژیاوە بۆیە ئەم ڕستەیەی وتووە. خوێنەریش وا تێدەگات قسەی (البلاذري)یە.

١٣-**بەعەرەبکردنی نەهاوەند:** شوان ڕستەیەك دەنووسێت لەبارەی نیشتەجێبوونی هۆزە عەرەبەکان لەشاری نەهاوەنددا ڕاستەوخۆ دوای گرتنی شارەکە (ل٢٦٢).

سەرچاوە: مێژووی تەبەری ٥/ ل١٥٣، الكامل في التاريخ، ٢/ ٣٨٠، البداية والنهاية ،بەرگی ٤/ج٧/ ل١٢٩-١٣١.

هیچیش لەمانە یەك وشە لەبارەی ئەمەوە ناڵێن. ئەو بەرگ و لاپەڕەیەی تەبەری باسی پیلانەکەی کوشتنی عوسمان دەکات، ل(٥٣)و (٢٥٣)و بەرگی ٤، ل(٥٣)و (١٥٣) گەڕام نەوەکو مەسەلە هەڵەی چاپ بێت بەڵام هیچم نەدۆزییەوە. بە هەمان شێوە ئەمەم لە چاپەکانی لای خۆمی(الكامل)و (البداية) نەبینی.

١٤-**لەهەمان لاپەڕەدا کاك شوان دەڵێت:** عەرەبەکان سەر بە هۆزی (الاسد) لە شاری (ماسبذان)دا نیشتەجێ ببوون، هەروەها لەهەمەدان و سیسردا هۆزی (العجلی)تێدا نیشتەجێ ببوون (ل٢٦٢) ناوی (فتوح البلدان) ی (البلاذری)ش ل٣٠٥-٣٠٧ دەهێنێت. بەڵام شتی وا لەم کتێبدا نییە. (البلاذري) لە نەوەیەکی (خشرم بن مالك بن هبيرة الاسدي) دەگێڕێتەوە کە یەکەم جار کوڕانی (خشرم) دابەزینە (ماسبه ذان) لە ڕۆژانی کۆتایی ئومەوییەکان بوو (ل٣٠٥) واتە باس لە هۆزی ئەسەد (ئەسەد نەك الاسد وەك شوان دەڵێت) نەکراوە بەڵکو باس لە بنەماڵەیەکی کراوە کە چوونەتە (ماسبه ذان) ئەویش لە کۆتایی سەردەمی ئومەوی. بۆ هەمەدانیش باسی قەڵایەك دەکات ئەویش (ماذەران) کە (السري بن نسير بن ثور العجلي) گرتبووی (ل٣٠٦) ئیتر کوا باس لە نیشتەجێبوونی هۆزی (العجلي) لە هەمەدان کراوە؟ سەبارەت بە (سیسەر)یش (البلاذري) باسی ناردنی (مرة بن أبي مرة الرديني العجلي) لەلایەن (هارون الرشيد)ەوە وەك فەرمانڕەوا بۆ سیسەر ئیتر چۆن ئەمە بووە نیشتەجێبوونی هۆزەکە لەوێ؟ کاك شوان بنەماڵەیەك و دوو کابرای لای دەبن بە دوو هۆز. کاك شوان تەنانەت ناشزانێت چۆن ناوی هۆزەکان بنووسێت. ئەو دەبینێت البلاذري ناوی کابراکان وا دەنووسێت: الاسدي، العجلي ئیتر وا دەزانێت ناوی هۆزەکان (الاسد)و (العجلي)یە!

١٥- **سەبارەت بەکووفەو بەسرە** کاك شوان دەڵێت عەرەبەکان لەوێدا دەمانەوەو سەرچاوەکانی داهاتی دانیشتوانی ئەم شارەیان (مەبەستی لەدینەوەرو نهاوەندە) بۆ خۆیان دەبرد (ل٢٦٢) ناوی کتێبی (الاخبار الطوال)، ل٣١٤ دەهێنێت کە لەڕاستیدا باس لە کوژرانی عەبدوڵڵا کوڕی زوبەیر (نەوەکو هەڵەی چاپیش بێت گەڕام وبینیم ئەمە نە لە لاپەڕە ١٣٤و نە لە لاپەڕە ١٤٣ هەبوو) هەروەها ناوی کتاب البلدان ،ل ٣٧ دەنووسێت لەکاتێکدا لەم کتێبەدا ئەو لاپەڕەیە باس لەدینەوەر بەتەنیا دەکات کەپێی دەوترێت (ماهی کووفە) چونکە پارەکەی دەخرایە (عەطاء) مکانی خەڵکی کووفەو باس لە نەهاوەندو بەسرە نەکراوە. خۆشی ئەوەیە کاك شوان دوای ئەم قسانە دەبێتە واعیزو لەبارەی نیشتەجێکردنی عەرەب دەڵێت ((لێرەدا دەبینین پرانسیپە ئایینیەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام فەرامۆش کراون و گرنگی سەرەکی لای عەرەبە موسڵمانە دەسەڵاتدارەکان تەنها بۆ دەوڵەمەند بوون و پایەی سیاسی و کۆمەڵایەتی بووە))!

١٦-**ئەمانەی سەرەوە هەموویان** لەتەنها یەك لاپەڕەدا بوون، لەلاپەڕەکەی دواتریشدا کاك شوان نەشارەزایی خۆی لەزمانی عەرەبی و لەزاراوەکانی ئەوکاتە دەسەلمێنێت و باسی شاری (ئەردەبیل)ی ئازەربایجان دەکات کەژمارەیەك عەرەبی تێدا نیشتەجێ کران بۆ چاودێری و کۆکردنەوەی داهات (ل٢٦٣، پێشتریش لە ل٢٥٦ ئەمە بەدەر لەباسی ئازەربایجان دەڵێت).

کاك شوان لەم ڕستەیە تێناگات ((من اهل العطاء والديوان)). واتە ئەوانەی (عطاء)یان پێدەدرا کە هەر موسڵمانێك بچووك بێت یان گەورە، عەرەب بێت یان غەیری عەرەب پارەی ساڵانەی هەبوو[٧٦]، ئەوانەش ناویان لە دیوان (=سجلەکانی دەوڵەت)دا ناویان نووسراوە، ئیتر ئەمە لەکوێ‌و چاودێرو کۆکەرەوەی داهات لەکوێ!

**١٧- شوان دەڵێت:** عەرەبەکان خۆیان دەکرد بەخاوەنی زەوی‌وزارەکان‌و دانیشتوانی ڕەسەن‌و خاوەن زەوییان وەك کشتیارێك (مزارع) بەکاردەهێنا (ل٢٦٣)و کتێبی(فتوح البلدان)ل ٣٢٤ – ٣٢٥ دەنووسێت.

سەرەتا خوێنەر وا تێدەکات (البلاذري) مەبەستی لەهەموو وڵاتێکە چونکە باسەکە بەگشتی وتراوە هەرچەندە لەژێر خانەی (ئازەربایجان)دا دانراوە، ئەمە لەکاتێکدا (البلاذري) باسی تەنها ئازەربایجان دەکات.

ئەم کارەی شوانیش دوورە لەئەمانەت. پاشان (البلاذري) وا ناڵێت بەڵکو دەڵێت هەر قەومێك ئەوەندەی توانیان شوێنیان گرت‌و هەندێکیان زەوی‌و زاریان کڕی. شوان دوا بەدوای ئەوە دەڵێت کەئەم کارە کشتارییەی خەڵکەکە لەبەرامبەر بڕێکی کەمی بەرهەمی زەوییەکانی خۆیان لەلایەن عەرەبە داگیرکەرەکانەوە پێدەدرا (ل٢٦٤)و ناوی نامەی دکتۆرای دکتۆر حسام الدين (اذربيجان دراسة سياسية حضارية) ل٨٨ دەهێنێت لەکاتێکدا دکتۆر حسام الدين هەمان قسەی (البلاذري) دەکاتەوەو هیچ ناڵێت لەبارەی ئەوەی بڕێکی کەمی بەرهەمی زەوییەکانیان پێ دەدرا. ئیتر ئەگەر کاك شوان ئەمانەت لەگەڵ سەرچاوەی مامۆستایەکی زانکۆی خۆی نەپارێزێت دەبێت چاوەڕێی چیی لێ بکەین.

**١٨-کێوەکەی ماردین:** کاك شوان (ل٢٢) باس لەو شاخە دەکات کەقەڵای ماردینی لەسەرەو ((کە بەرزییەکەی بە فەرسەخ ناوبراوە))– صورة الارض، ل٢٠٢" تقويم البلدان، ل٢٧٩.

(ابو الفِداء) لە تەقویمدا دەڵێت لەزەوییەوە تا لوتکەی ئەو شاخە نزیکەی دوو فەرسەخە !! کاك شوانیش بەم جۆرە تێگەشتووە. ئیبنو حەوقەل لەو لاپەڕەیەی (صورة الارض)دا دەڵێت ماردین قەڵایەکی قایمە زەفەری پێ نابڕێت‌و لەسەر لوتکەی کێوێکی بەرزەو باسی فەرسەخ ناکات. باسی فەرسەخ لای ئەو لە لاپەڕە ١٩٤دایە ئەویش هەر هەمان قسەی ئەبولفیدایە[٧٧].

**١٩- مووصڵ:** شوان دەڵێت ((کورد هەر لەکۆنەوە لەموسڵ‌و دەوروبەری نیشتەجێ بوون)) (ل٣٦ شوان). سەرچاوە: المسعودي، مروج الذهب، ج٢/ل١٠١، ابن حوقل، صورة الارض، ل١٩٥.

مەسعوودی (لەو چاپەی لای خۆم: لاپەڕە ١٢٤) باسی چەند تاقمێکی کورد دەکات کەنەصرانین‌و نیشتەجێکەیان لەدوای مووسڵ‌و کێوی جودی بوو.ئیبنو حەوقەلیش دەڵێت خەڵکەکەی عەرەبە. هەروەها دەڵێت خێڵی عەرەب‌و کورد (ناویان دەبات) گەرمیان‌و کوێستانی تێدا دەکەن.

شوان لە پەراوێزی ** لاپەڕە (٢٢٩)دا هەمان شت دووبارە دەکاتەوە لەمەوەو دەڵێت ((بۆیە ئەو خەڵکەی یارمەتیی تکریتیان دا کورد بووینە)).

**٢٠-هەڵگەڕانەوەی شارە کوردییەکان** لەدەسەڵاتی عەرەبە موسڵمانەکان لە بەشێکی ماستەرنامەکەدا هەیە. کاك شوان لەکاتێکدا لەچەند شوێنێکی کتێبەکەیدا موناقەشەی ڕاوبۆچوونە جیاوازەکانی مێژوونووسان دەکات لەبارەی ساڵانی گرتنی شارەکان هەروەها ساڵانی هەڵگەڕانەوەیان دەبینین لەم بەشەدا ئەمەی لەیاد دەچێت‌و هەریەك لەو ساڵە جیاوازانە

---

[٧٦] کەس لە سێ سەد درهەم کەمتری نەبوو، هەشبووە چەند هەزاری وەردەگرت. منداڵی تازە لەدایکبوو سەد درهەمی هەبووو کە گەورە دەبوو بۆی دەکرایە دوو سەدو کە باڵغ دەبوو بۆی زیاد دەکرا. تەنانەت منداڵی فڕێدراویش سەد درهەمی بۆ سەرف دەکراو جگە لەمە پارەیەکی مانگانە دەدرایە ئەو کەسەی بەخێوی دەکردو ساڵ بە ساڵ پارە بۆ منداڵەکە زیاد دەکراو عومەر ئامۆژگاریی ئەوەی دەکرد چاکە لەگەڵ ئەو فڕێدراوانە بکرێت(بڕوانە بۆ ئەمانەی سەرەوە وەك نموونە: فتوح البلدان، ل٤٣٨). بۆ ماوەیەکیش لەسەردەمی عومەردا دەبوایە منداڵەکە لەشیر ببڕدرێت ئینجا (عەطاء)ی پێبدرێت تا جارێکیان عومەر تێبینی ئەوەی کرد ئافرەتێك بەزۆر دەیویست منداڵەکەی لەشیر ببڕێت، کە لەژنەکەی پرسی بۆ وا لەمنداڵەکەی دەکات ژنەکە (کەعومەری نەناسییەوە) وتی چونکە عومەر هیچی بۆ نابڕێتەوە تا لەشیر نەبڕدرێت، عومەر کەپێشنوێژیی بەیانیی دەکرد لەبەر گریان دەنگی دەرنەدەهات‌و دواتر وتی: بەدبەختی بۆ عومەر دەبێت چەند منداڵی موسڵمانانی کوشتبێت، دواتر بڕیاری دەرکرد منداڵ هەر لە کاتی لەدایك بوونیەوە (عەطاء)ی بۆ بنووسرێت.بڕوانە البداية والنهاية، مجلد ٤، ج٧، ل١٣٥–١٣٦.

[٧٧] ئەمە یان موبالەغەیەو یان مەبەست درێژترین ماوەی قەدپاڵەکەیە.

دەکاتەساڵێکی ڕاستەقینە. بۆ نموونە لەبارەی شاری هەمەدانەوە دەڵێت زۆربەی سەرچاوەکان ڕێکن کە شاری هەمەدان ڕاستەوخۆ دوای شەڕی نهاوەند ل٢١ك/ ٦٤٢ز گیراوە لەگەڵ ئەوەشدا چەند سەرچاوەیەك باس لەوە دەکەن شارەکە ساڵی ٢٣كو ٢٤ ك گیراوەتەوە واتە (بەپێی شوان) شارەکە دووجار ڕاپەڕیوە (ل٢٤٦ –٢٤٧).

شوان نزیکەی حەفتا لاپەڕە پێش ئەوە ساڵی ٢١ بۆ گرتنی یەکەمی پەسەند دەکات (ل١٧٤) پێشتریش بۆچوونی تر دەڵێت: ساڵی ٢٣ یان ٢٤ .. (ل١٧٢) بەڵام پاش ئەم لاپەڕانە چیی وتووە لەبیر دەچێت، یان خۆی لێ لادەدات و هەر یەك لەم ڕاوبۆچوونە جیاوازانە دەکاتە ڕووداوێکی ڕاستەقینەو ساڵی ٢١و دەبێتە یەکەم گرتنو ٢٣و ٢٤ یەکەمو دووەم هەڵگەڕانەوە، کە لەڕاستیدا هەمووی یەك جار هەمەدان هەڵگەڕابووەوە.

نموونەی تر شاری (ماسبەذان)ـە. شوان دەڵێت سێ جار هەڵگەڕاوەتەوە لەکاتێکدا یەك جار بووە. شوان (ل٢٤٤) دەڵێت یەکەم ڕاپەڕینی شارەکە لەسەر دەستی (حُذَیْفَة) ساڵی ١٨ دامرکێنرایەوەو ناوی مێژووی (خلیفة بن خیاط/ ج١) دەنووسێت، دەشڵێت جاری سێیەم لەدوای شەڕی نەهاوەند بوو (واتە لای شوان دوای ساڵی ٢١)و (حوذەیفە) شارەکەی گرتەوە(ل٢٤٤–٢٤٥)و دیسان ناوی مێژووەکەی خەلیفە دەنووسێت. هەر بە ڕواڵەت ئەمە هەڵەیە ، بڕوانە لاپەڕە ١٥٨–١٦٠ی شوان بکە دەبینی پێنج بۆچوونی هێناوە لەبارەی ساڵی گرتنی شارەکەو تەنها لە یەکێکیاندا (ئەوەی دوای شەڕی نەهاوەند) ناوی حوذەیفە هاتووە[٧٨].

خەلیفە بۆ جاری یەکەم ناوی حوذەیفە نابات وتەنها باسی گرتنی شارەکە دەکات و بۆ جاری سێیەم خەلیفە ناڵێت ئەمە سێیەم هەڵگەڕانەوە بوو بەڵکو دەڵێت بۆ (سەعد) گیراو دوایی هەڵگەڕایەوەو حوذەیفە گرتیەوە، واتە تەنها یەك جار هەڵگەڕابووەوە. کاك شوان خۆشی نازانێت چۆن سەرچاوەکان بەکاربهێنێت و بەئارەزووی خۆیو بەو ئەندازە کەمەی تێگەشتنی لە دەقەکان هەڵگەڕانەوەی شارەکان دەکاتە دوو جارو سێ جار. ترسی سەریەشەی خوێنەر نەبووایە باسی ئەو سەرچاوانەی ترم دەکرد کە شوان نووسیونیو زیاتر لەسەر ئەمە دەڕۆشتمو باسی هەڵگەڕانەوەی شارەکانی دیکەم دەکرد.

٢١-<u>ڕووداوێکی خۆش:</u> سەرچاوەکان دەگێڕنەوە کە (ئەبوو مووسا ئەلئەشعەری) هانی خەڵکی دا شەڕ دژی خەڵکی (ایذج)و کوردەکان بکەن کە هەڵگەڕابوونەوەو باسی فەزڵی جیهادکردن بە پێ و بێ وڵاخی بۆ کردن. هەندێك لە خەڵکەکە وتیان باچاوەڕێ بکەینو بزانین ئەو بۆ خۆی چی دەکات، ئینجا بینیان کەلوپەلەکانی خۆی سواری چل ئیستر کرد، ئەمانیش شکاتی لای عوسمانیان لێکردو عوسمان لایبرد. ئەمە کورتەی ڕووداوەکەیە کە سەرچاوەکان باسی دەکەنو کە کاك شوان سیانیان دەڵێت: مێژووی تەبەری ج٢ (ئەمە هەڵەیەو ڕاستەکە ج ٥) ل١٠٠و الكامل في التاريخ، ج٢/ ل٢٤١و مێژووەکەی ئیبنو خەلدوون بەرگی ٢، ج١/ ل١٣١. کەچی کاك شوان وای دەگێڕێتەوە کەشاری (ایذج)و کوردەکان ڕاپەڕینو ((شارەکەیان ڕزگار کرد بەڵام (ابو موسی) توانی ڕاپەڕینەکەیان دابمرکێنێتەوە. تالآنییەکی زۆریشی کردن[٧٩] تەنانەت ئەم تالآنییە کێشە لەنێوان خودی لەشکری عەرەبە موسڵمانەکاندا دروست کردو ئەنجام بەلابردنی (ابو موسی) لەوالییەتی بەسرا کۆتایی پێهات)) (ل٢٤٣). خۆش ئەوەیە کاك شوان پاش ئەوەی دەستکاریی چیرۆکەکەی کردووە (یاخود با بڵێین لێی تێنەگەشتووە) دەڵێت: ((لێرەدا زاڵ بوونی کاریگەری بەرژەوەندی ئابووری خۆی بەسەر عەرەبە موسڵمانەکان دا دەسەپێنێ!!؟ نەك بنەما پیرۆزەکانی ئیسلام)) – (نیشانەکانی!!؟ هی شوان خۆین). کاك شوان لە مەوعیزەوتن ناوەستێ.

٢٢-<u>کاك شوان لەلا پەڕە (١٨٥)دا دەڵێت</u> لەشکری هورموزان بەهۆی دەست ڕاستییان توانیان بەتیر سەد سوارەی لەشکری عەرەبە موسڵمانەکان بکوژن، لەنێوانیاندا (البراء بن مالك) برای (انس بن مالك) بوو.

[٧٨] شوان بۆ ئەمە دوو سەرچاوە دەنووسێت یەکێکیان البداية والنهاية، مج٤، ج٧، ل٧٣(لای خۆم ل٧٢). کەچی ئیبنوکەثیر ناوی حوذەیفە بەهیچ جۆرێك ناهێنێت و گرتنی شارەکە دەخاتە ساڵی ١٦ نەك دوای نەهاوەند کە شەڕی نەهاوەند بەپێی هەموو حسابێك دوای ساڵی ١٦ بوو.

[٧٩] چل بار ئێسترەکە وەك بینیمان کەلوپەلی ئەبوومووسا بوون بەڵام دیارە کاك شوان بە تالآنییەکانی دەزانێت!! لێرەدا جگە لەتێگەشتنی هەڵە (کەنەشارەزایی لەعەرەبی و بەتایبەتی عەرەبیی کتێبە کۆنەکان دەردەخات) بڕیاری ئامادەش دەوری بینیوە: کاك شوان ئەوەی لەمێشکدایە کە هەمیشە تالآنیی زۆرکراون بۆیە لێرەدا چل بار ئێستر کەنەك بۆ ناوچەیەك بەڵکو بۆیەك شاریش هیچ نییە لای دەبێتە ((تالآنییەکی زۆر)).

کاك شوان چوار سەرچاوە دەهێنێتەوە بۆ ئەمە دوو کۆنو دوو نوێتر. دوو کۆنەکە مێژووەکەی ئیبنوخەلدوون(مج٢،ج٢،ل١١٢)و ئەوەی (ابن الاثیر)، ج٢،ل١٦٣.

یەکەمیان تەنها باسی کوژرانی (البراء) لەگەڵ (مجزأة بن ثور) لەسەر دەستی هورموزان شەوی گرتنی (توستەر) دەکات! دووەمیشیان قسەکەی پێچەوانەی ئەوەی شوانە. (ابن الاثیر) دەڵێت کە (البراء) برای (انس) لە گەمارۆدانی شارەکە تا گرتنی سەد کەسی لەموبارزەدا کوشت جگە لەوانەی لەغەیری موبارەزە کوشتنی.. تاد.

دوو سەرچاوەکەی تریش کە نوێترن. (احمد دحلان، الفتوحات الاسلامیة، ج١/ ل١٣٤)و (محمد خضری بك: محاضرات تاریخ الامم الاسلامیة، ل٢١٠) هیچ شتی وا ناڵێن. یەکەمیان (چاپی لای خۆم ل١١٦-١١٧) یەك وشەی تێدا نییە لەوەی شوان دەیڵێتو دووەمیان (هەمان چاپی شوان) لەو لاپەڕەیەدا (ل٢١٠) باسی بەشێك لەشەڕی (القادسیة) دەکات کە زۆر پێش شەڕی توستەر بوو، گرتنی توستەریش لەلاپەڕە (٢٢١) دایەو نەك تەنها باسی ئەوە ناکات کە شوان بۆمان دەگێڕێتەوە بەڵکو تەنانەت ناوی (البراء)یش نابات.

٢٣-**<u>کاك شوان قسەیەکی دوورودرێژ</u>** لەبارەی هەرێمی (ئاران)و شوێنەکەی و لەمپەری نێوان ئارانو دەسەڵاتی دەوڵەتی خیلافەتو تا ئەو لەمپەرە هەبوایە.. تاد (ل٢٤٩) .سەرچاوەش:

١-فتوح البلدان ل٣٠٧: بەڵام ئەم کتێبە باسی ئاران لە لاپەڕە ٢٠٥-٢٠٦ دەکاتو بەم جۆرە: ل٢٠٥ گرتنی ئارانو ل٢٠٦ گرتنی چەند شوێنێك لەئارانو باسی لەمپەر.تاد ناکات.

٢-الخراج وصناعة الکتابة ل٣٣١- ئەم باسە لەم کتێبەدا نییەو تەنانەت ناوی ئارانیش لەو لاپەڕەیەدا نەهاتووە. بڕوانە پێڕستی ناوەکان تا بزانی کە ئەو لاپەڕانەی باسی ئارانیان تێدایە هیچ شتێکیان تێدا نییە لەوەی شوان دەیڵێت.

٣-مێژووەکەی ئیبنوخەلدوون بەرگی ٢/بەشی٢/ ل١٢٧- ئیبنوخەلدوون تەنها ناوی ئارانی هێناوەو هیچ شتێکی وای نەوتووە.

ئیتر هیچ لەم قسانە لەهیچ لەم سەرچاوانە نەهاتووە.

٢٤-**<u>کاك شوان (ل٦٩)لەبارەی (سیسەر)ەوە دەڵێت:</u>** سیسەر واتە: سی سەر مەڕو پێشتر ناوی (صدخانیة) بووەو واتە سەدکانی چونکە کانی ئاوی زۆرە، (بلاذری)و (ابن الفقیه)ش دەڵێن هەمان مانا دەگەیەنێت. سەرچاوە: فتوح البلدان ل٣٠٧و مختصر کتاب البلدان، ل٢٣٩.

زانیارییەکانی دوو سەرچاوەکە وەکو یەکن لەبەر ئەوە پێکەوە باسیان دەکەم. باسەکەش ئەوەیە ناوەکەی لەوەوە هاتووە کە لەنزماییدایە لەنێوان لوتکەی سی تەپۆلکە بۆیە وترا (سی سەر).سیسەریش پێی دەوترا صدخانییە واتە سی سەرو سەد کانی ئەویش لەبەر زۆریی کانییەکانی.واتە کەس باسی لە (مەڕ)و لەلێکچوونی واتای (سیسەر)و (صەدخانیە) نەکردووە.

٢٥-**<u>شوان باسی هەمەدان دەکات</u>** کە ((تا ڕادەیەك دەکەوێتە خۆرهەڵاتی هەرێمی چیاکان)) - لاپەڕە (٧٠). سەرچاوەش: مختصر کتاب البلدان، ل٢٠٩، کتاب البلدان ل٣٩، الاصطخری، المسالك والممالك ل١١٥.

سەرچاوەی یەکەم تەنها ناوی هەمەدان دەبات کەسەر بەهەرێمی چیایە. سەرچاوەی دووەم یەك وشە لەقسەی شەوان ناڵێت، سەرچاوەی سێیەمیش دەڵێت لەشارەکانی چیایە. تەنانەت بڕوانە نەخشەکەی (الاصطخری) بەرامبەر لاپەڕە ١١٦ دەبینی ناوبراو شارەکەی خستۆتە ناوەڕاستی هەرێمەکە نەك ڕۆژهەڵاتی نە بەتەواوەتیو نە تا ڕادەیەك.

٢٦ - **<u>لەبارەی هەڵگەڕانەوەی شمیشاتەوە:</u>** شوان دەڵێت کە عیاض کوڕی غەنەم هێزێکی بە فەرماندەیی حەبیب کوڕی مەسلەمەی فیهریی ناردە سەر شاری (شمیشاط) کە هەڵگەڕابووەوەو دوای گەمارۆدانی توانی دووبارە بیگرێتەوە (ل٢٥٢). سەرچاوەش: فتوح البلدان، ل١٨٠و الخراج وصناعة الکتابة، ل٣١٧.

(البلاذري) دەڵێت (عیاض) چوو بۆ شمیشاطو بینی (حەبیب) و(صەفوان کوڕی ئەلموعەططەل) گەمارۆیان داوە(..) ئیتر خەڵکەکە صوڵحیان لەگەڵدا کرد(ل١٧٩) کە ئەمە گرتنی یەکەمە. پاشان باسی هەڵگەڕانەوەی شارەکە دەکاتو چوونی ناوبراو بۆ شارەکە(ل١٨٠) ئیتر چ شتێکی قسەکەی کاك شوان لەمە دەچێت؟! سەرچاوەی دووەم دەڵێت موعاویە ئەو دوو

کەسەی نارد(ل٣١٦) دواتریش دەڵێت کە (عیاض) حەبیبی لە شمیشاتەوە بۆ مەلاتیە نارد..تاد (ل٣١٧) کە دیسان لە قسەکەی کاك شوان ناچێت.

**٢٧- لەبارەی هەڵگەڕانەوەی ئۆرفە(ئەلرها):** (عیاض) بە وتەی شوان ((گەمارۆی دلو دوای ماوەیەك دووبارە خستیەوە ژێر دەسەلاتی عەرەبە موسڵمانەکان))- شوان ل٢٥٠. سەرچاوەش: فتوح البلدان، ل١٨٠و الخراج وصناعة الكتابة، ل٣١٣.

سەرچاوەی دووەم ئەوەی تێدا نییە، سەرچاوەی یەکەمیش دەڵێت کە کاتێك ناوبراو دابەزی ئەوان دەرگاکانی شارەکەیان بۆ کردەوە ئەویش چووە ناویەوە.

سەرەڕای ئەوەش شوان دەڵێت سەرچاوەکان باسی کاردانەوەی توندوتیژی لەشکری موسڵمانان ناکەن (هەمان لاپەڕە) وەك چۆن هەر شارێك گیرابێتەوە موسڵمانان بە توندوتیژی مامەڵیان لەگەڵدا کرابێت. یان وەکو ڕەخنە دەڵێت کە یەکێك لە بەندەکانی ڕێککەوتنی هەردوولا لە یەکەم جاردا ئەوە بوو پاراستنی دانیشتوانی شارەکە لە ئەستۆی موسڵماناندایە بەلام ئەگەر ئەم پاراستنەیان ڕەت کردبێتەوە ئەوە بێگومان موسڵمانان کاردانەوەیەکی توندوتیژیان هەبووە (هەمان لاپەڕە). ئەم قسانەش جگە لەوەی ڕەبتیان نییە قسە هەڵبەستن و پێچوپەناکردنن بۆ تەفسیرکردنی نەبوونی کاردانەوەی توندوتیژ دژی شارەکە، تەفسیرێك هیچ شتێك تەفسیر ناکات غەیری ئەوەی موسڵمانان شتێکیان دەکرد (=پاراستنی شارەکە) کە ئاواتی هەموو کەسێکە شارەکەی بگیرێت و لە تەعداو پشێوی بترسێت.

شوان یەکسەر دوای ئەوە دەڵێت: ((چونکە هەندێ لە سەرچاوەکان ڕاپەڕینی شارەکان بە (تکفیر) لە قەڵەم دەدەن، هەڵبەت مێژوونووسان هەوڵییان داوە بە زمانی سەردەمی پرۆسەی فتووحات دەقەکانیان بنووسنەوە))-شوان ل٢٥٠-٢٥١.

جارێ ناوترێت ((تەکفیر)) - کە واتای بەکافردانان دەدات - بەڵکو دەوترێت ((کوفرکردن)). کوفر لە ئیسلامدا بە ژمارەیەك شت دەوترێت کە واتای باوی کوفر یەکێکیانە. وشەکە لە باسی فتووحاتدا بە واتای ((کوفرکردنی پەیمان)) واتە شکاندنی پەیمان بەکارهاتووە. ئیتر ئەمە پەیوەندیی بە مەسەلەی ئیمانەوە نییە تا شوان وای لێ تێبگات لەبەر ئەوەی ئەم هەڵگەڕانەوەیە کوفرکردنە کەواتا پێویستە بە توندی مامەڵە لەگەڵ ئەو شارەی هەڵگەڕاوەتەوە بکرێت. ناهەقی کاك شوانیش ناگرین وا لە وشەکە گەشتبێت چونکە بینیمان کاك شوان لە وشەی زۆر ساکارتری عەرەبی نەگەشتووە.

**٢٨ - شوان شوێنی جەزیرە دیاری دەکات:** ((مەبەست جەزیرەی فوراتیە ئەم دەڤەرەی دەکەوێتە نێوان دیجلەو فورات سەرووی خاکی سەواد ((ڕەشە خاك))و باکووری تکریت و بە ڕووی دیجلەوەو حدیثة لەسەر فورات تا دەگاتە چیاکان))،(وەکو خۆی نووسیومەتەوە)- شوان، ل١٨ پ ٣. سەرچاوەش : مختصر كتاب البلدان، ل٢٦-٢٧، اثار البلاد واخبار العباد، ل٣٥١.

سەرچاوەی یەکەم دەڵێت: ناونرا جەزیرە لەبەر ئەوەی فورات و دیجلە دەبڕێت و پاشان دەشتایی دەبڕێت (ل٢٦) .دووەمیشیان بۆ جەزیرە دەڵێت: دەکەوێتە نێوان دیجلەو فورات. ئیتر غەیری ئەوە هیچ شتێك لەو قسە دووروودرێژەی شوان لەو دوو سەرچاوەیەدا نەهاتووە.

**٢٩- شاری دەستگرد** :((شارێکی زۆر کۆنەو دەگەڕێتەوە سەردەمی کیسرای یەکەم کە هەندێ وەرزی ساڵی لەوێ بەسەربردووە))- شوان ، ل٥٤.سەرچاوەش:كتاب البلدان، ل٣٦" الاصطخري ، المسالك والممالك، ل٦١، تقويم البلدان،ل٣٠٧، کریستنسن، ايران في عهد الساسانيين، ل٤٣٨.

<u>کریستنسن</u> دەڵێت: هێرتسفێلد بەڵگەکانی ئەو نووسەرە عەرەبانەی پووچەڵ کردەوە کە دەڵێن هورموزدی یەکەم دروستکەری دەستگرد بووە. پاشان دەڵێت: بەهەرحاڵ تەنها لەسەردەمی کیسرای یەکەمەوە پادشای ساسانییەکان پێیان باشتربوو لە عیراقدا نیشتەجێ بن.

<u>كتاب البلدان</u>: دەسکەرەی پادشا، خانووی پادشایانی فارسی تێدایە کە سەیر دروستکراون.. تاد.

<u>تقويم البلدان</u>: نزیکە لەوەی سەرەوە + شارێکی کۆنە (نەك: زۆر کۆنە).

المسالك والممالك: دەوترێت کە پادشا هەندێ وەرزی ساڵ لەوێدا دەمایەوە(نوسخەی تری کتێبەکە: کیسرا.. بەڵام نوسخەکە نەیوتووە کیسرای چەندەم).

واتە تەنها (تقويم البلدان)و(المسالك والممالك) شتیان تێدایە لە قسەکەی شوان بچن ئەویش پاش دەستکاری کردنی قسەکان لەلایەن شوانەوە. خۆ ئەگەر هەر سەرچاوەیەك شتێکی تێدابوویە لەوەی شوان نووسیوەتی کارەکەی هەر نازانستی دەبوو چ جای ئەوەی دوانیان ئەوەیان تێدا نەبێتو دوانەکەی تر بە دەستکاریو سەقەتییەوە نەقڵ بکرێن.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە یەکێکە لە حاڵەتە باشەکان کە لەو سەرچاوانەی شوان ناوی نووسیون شتێك هەیە لە قسەکەی شوان بچێت.

٣٠- دووپشکەکانی شارەزوور: شوان باس لە دووپشکەکانی شارەزوور دەکات کە لە دووپشکەکانی نەسیبین کاریگەرترن (شوان، ل٣٨) – سەرچاوە : فتوح البلدان، ٣٢٩" الخراج و صناعة الكتابة، ل٣٨٣" الثعالبي ل٤٨٨ – ٤٨٩" معجم البلدان، ج٥، ل٢٨٨.

الثعالبي باسی شەڕی نێوان سابووری فارسیو قوستەنتینی بیزەنتی دەکاتو ئەوە هاتووە کە سابوور فەرمانی دا دووپشك لەشارەزوورەوە بهێنرێنو فڕێیان بدەن ئەویش کاتی گەمارۆدانی نەسیبین. ئیتر بزانە ئەمە چەند لەقسەکەی شوانەوە دوورە. لەو دوورتر قسەی سەرچاوەی یەکەمو دووەمە کە باسی گرتنی شارەزوور لەلایەن موسڵمانانەوە دەکات و ئەوەیان تێدایە کە دووپشکەکانی خەڵکیان دەکوشت ئیتر نە بەدوورو نە بەنزیك باسی نەسیبین نەهاتووە. بەرگ و لاپەڕەی سەرچاوەی چوارەمیش باسی نەسیبینی تێدایە بەڵام ئەو شتە ناڵێت کە شوان نووسیویەتی. ئەو قسەیە لە بەرگی ٣، ل٣٧٥ دا هەیە کە باسی شارەزوورە.

٣١- باسی حصنكيف: شوان (ل٢٧) دەنووسێت: ((ئیبن حوقل دەڵی ((قەڵایەکی سەختو دژوارەو چەندین خەرەندی شاراوەی هەیە لە چیایەکاندا)) ، ئەمە هەڵکەوتەی شارەکەی وا هەڵخستووە کە زەفەری پێ نەبردرێت))– صورة الارض، ل٢٠٢" فيلد، جنوب كردستان ، ل١٧.

ئیبنو حەوقەل لەڕاستیدا باسی قەڵاکە دەکات کە شاراوەیە (پیتاوپیت: نێژراوە) لەناو کێوەکاندا جگە لەو لایەی دەڕوانێتە سەر دیجلە. ئەمەش دیارە مەبەست قەڵاکەیە کە شاراوەیە نەك خەرەندەکان ئەگەر چیش پێشتر باسی شیو کراوە. فیڵدیش لەلایەن خۆیەوە باسی دیجلە دەکات پاش ئەوەی ئاوی (بەتمان) دەڕژێتە ناویو کە باریکترو قووڵترو خێراتر دەبێت (..)و پاش حصنكيف دۆڵەکە فراوان دەبێت.. ئیتر فیڵد نە باس لە هەڵکەوتەی شارەکەو نە باس لە زەفەر پێنەبردنی کردووە. ئیبنو حەوقەلیش دەڵێت دۆڵو شیوی تێدایە زەفەریان پێ نابرێت (نەك شارەکە زەفەری پێ نابرێت).

٣٢- کێ باسی (نێریز)ی کردووە؟ شوان لەبارەی هەڵگەڕانەوەی شارەکانی ئازەربایجان لە لاپەڕە (٢٤٩) دەنووسێت والیی کووفە الوليد کوڕی عوقبە (عبدالله بن شبيل بن عوف الاحمسي) بە فەرماندەی لەشکرێکی ٤٠٠٠ جەنگاوەری ناردە سەر شاری (نێرێز)و توانی بیگرێتەوە. سەرچاوەش: فتوح البلدان، ل٣٢٣و الخراج وصناعة الكتابة، ل٣٧٠-٣٧١.

البلاذري لە (فتوح)دا باسی پەیمان شکاندنی ئازەربایجان بەگشتی کردووەو ناوی (نريز – ئەویشو قودامە بەم شێوەیە ناوی دەبەن)ی نەهێناوە. ئەوەش دەڵێت کە ئەلوەلید کوڕی عوقبە چووە سەر ئازەربایجان پاش ئەوەی پەیمانەکەیان شکاندو لەپێشەنگی لەشکرەکەی (عبدالله شبل الاحمسي – البلاذري وای نووسیوە)و هێرشی بردە سەر چەند شوینێکی تر کە هیچیان نريز نییە. باسێکی هاوچەشنیش لە لاپەڕە (٣١٨)ی فتوحدا هەیە بەڵام ناوی هیچ کەسێك لەگەڵ ئەلوەلیددا نەکراوە.

لاپەڕە ٣٧٠-٣٧١ی کتێبی دووەمیش باسی گرتنی وڵاتی چیاو نەهاوەند دەکات نەك ئازەربایجان، باسی ئەلوەلیدو ئازەربایجانیش لە هەردوو لاپەڕە ٣٧٧و ٣٧٩ دا هەیەو بەم جۆرە: ل٣٧٧ هەمان باسی ل٣١٨ی (فتوح)ـە. لاپەڕە ٣٧٩ ش (هەروەها ل٣٢٤ی فتوح) باسی ئەلوەلیدو (ئەلئەشعەث کوڕی قەیس)و ئازەربایجان دەکات بەڵام بەشێوەیەکی جیا لەوەی سەرەوە.بەکورتی نەباسی گرتنی نريز کراوەو نە ئەو باسانە لەو قسانە دەچن کە شوان نووسیونی.

**٣٣- شەهارجە:** شوان (ل١١٩) باس لە تکریت دەکات کەبەر لەفتووحات کوردی مەسیحیی تێدا بوو پاشان دەڵێت:((ڕەنگە ئەمەش هۆکارێکی سەرەکی بووبێ کە کوردە شەهاریجیەکان کە پەیڕەوکاری ئاینی مەسیحی بوون‌و لەسەرووی جەزیرەوە هاتن بۆ هاوکاری سوپای ڕۆم لەپێناو یارمەتیدانی دانیشتوانی تکریت لەدژی سوپای عەرەبە موسڵمانەکان)).

شوان بۆ ئەم قسە گەورانە دوو سەرچاوەی نووسیوە، یەکێکیان (صورة الارض)ی ئیبنو حەوقەل، ل١٩٤–١٩٥و ئەوەی تر کتێبەکەی حُمادی" الجزيرة الفراتية..، ل١٧٦.سەرچاوەی یەکەم یەك وشە لەم بارەیەوە ناڵێت‌و تەنها وەسفی مووصڵی تێدایە.سەرچاوەی دووەم خۆشترە چونکە نووسەرەکەی دەڵێت: شەهارجەکان کورد بوون‌و کۆمەکی عەرەبیان کرد کاتی گرتنی تکریت.

سەرچاوەکان باسی شەهارجە دەکەن کە سەرەتا لە بەرەی دژ بە لەشکری ئیسلامی بوون، بەڵام ئەوانە قسەی گەورەن کاك شوان دەیانکات‌و سەرەڕای ئەوەش لەو دوو سەرچاوەیەدا نین کە ناوی نووسیون.

**٣٤- کوردو کۆمەکی ڕۆمەکان:** شوان (ل٢١٤) باسی گەمارۆدانی ئەبووعوبەیدە لە شاری (حیمص) لەلایەن ڕۆمەکانەوە:((کە ژمارەی هێزی پشتگیریی کورد بۆ ڕۆمەکان ٣٠ هەزار مەزەندە کراوە)). سەرچاوە: مختصر كتاب البلدان، ل٢٩٢" تەبەری، ج٤، ل٢٣٢–٢٣٣" الكامل في التاريخ، ج٢، ل١٥٢، الروض المعطار في خبر الاقطار، ل١٦٤، ابن خلدون، مج٢،ج٢، ل١٠٨.

جگە لە سەرچاوەی سێیەم ئەوانەی تر باسی ئەم ژمارەیە ناکەن بەڵکو تەنانەت باسی کوردیش ناکەن. ئەمان باسی کاری هاوبەشی ڕۆم‌و خەڵکی جەزیرە دەکەن، تەنانەت باسی عەرەبی جەزیرەش هاتووە. سەرچاوەی سێیەم باسی ٣٠ هەزار کەسی جەزیرە دەکات جگە لەوانەی (قِنّسرين) لە خێڵی تەنووخ‌و خەڵکی تر. کەواتە لە هەر پێنج سەرچاوەکەدا ناوی کورد نەهاتووە بەڵکو باسی خەڵکی جەزیرە بە گشتی کراوەو عەرەبی نەصرانی هەبوو لەناو ئەوانەی کۆمەکی ڕۆمیان کرد. جەزیرەش پێش فتووحات جگە لە کورد ژمارەیەك هۆزی عەرەبی‌و خەڵکی تریشی تێدابوو. ئیتر ئەمە نەپاراستنی ئەمانەتی مێژووییە کە سەرچاوەکان بە گشتی باسی جەزیرە بکەن‌و زۆربەیان لەناو ئەوانەی کۆمەکی ڕۆمیان کرد ناوی عەرەب دەبەن کەچی شوان هەموویان بکاتە کوردو تەنانەت سەرچاوەیەك باس ٣٠ هەزار خەڵکی جەزیرە بەگشتی بکات کاك شوان دەیکاتە ٣٠ هەزار کورد.

## پاشکۆ
## چەند سەرچاوەیەکی تر بۆ چاپی دووەم

**یەکەم: کتێبی (تاريخ ارمينيا)ی پۆل ئەمیل:**

**١–ل٢٠٨شوان:** ((ئەو دەڤەرە بەتەواوی کەوتە دەستی لەشکری عەرەبە موسڵمانەکان، بەڵام تا ساڵی ٣٣ك/٦٥٤ز هێشتا ئارامی‌و یەکلابوونەوەی بەخۆیەوە نەبینی –ل٢٣))(بە تەنیا).

لەو لاپەڕەیەدا یەك وشە لەم قسانە نییە، لەو لاپەڕەیەو لاپەڕەکەی پێشەوەی تەنانەت ژمارەی هیچ ساڵێکیش نەنووسراوە، ئەی کاك شوان ئەوەی لەکوێ ((بردووە))؟[80] تێبینی بکە ئەو سەرچاوەیە بە تەنیا نووسراوەو سەرچاوەی تری لەگەڵدا نییە تا بڵێین کاك شوان لێك تێکچووەو زانیارییەکان هی ئەو سەرچاوەی ترە.

٢-ل٢٠٩ شوان: کاك شوان باسی یەکلابوونەوەی ئەرمینیا بۆ موسڵمانەکان دەکات کە ئەمە بەهۆی تێکچوونی پەیوەندیی نێوان بیزنەتەو بەتریقی ئەرمینیا (تیۆدۆر رشدونی) بووو هاوکاریکردنی موسڵمانەکان لەلایەن ئەمەوە، ئینجا کاك شوان دەنووسێت: بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە بول امیل، تاریخ ارمینیه، ل٢٣-٢٤ (بەتەنیا).

یەکەم: ناوەکە لەو سەرچاوەیەدا (ڕاست بێت یان هەڵە) وا هاتووە: (تیۆدۆر ریشتونی)ـە نەك (رشدونی). ئەمە یەکێك لەو بەڵگانەی کە شوان ئەو سەرچاوەیەی لە سەرچاوەیەکی تر ((بردووە))[81]. کتێبەکە باسی ((پەیمانێکی شەریف))ی نێوان سەرکردە ئەرمەنییەکەو فاتحە موسڵمانەکان دەکات. ئەو پیاوەش لەو سەرچاوەیەدا وەك سەرکردە ناوبراوە نەك وەك بەتریق.

نووسەری کتێبەکە باسی پەیوەندی خراپی نێوان ئەرمەنەکانو بیزەنتییەکانی کردووە کە بۆتە هۆی ئەوەی سەرکردەی ئەرمەنی بچێتە ژێر حوکمی موسڵمانەکان، بیزەنتاش لەو پەیمانە نیگەران بووو پەلاماری ئەرمینیای داو ئەو سەرکردەیەی دەرپەڕاند بەڵام ئەو بە هاوکاریی موسڵمانان گەڕایەوەو نەك تەنها بووە فەرمانڕەوای ئەرمینیا بەڵکو هەروەها ئیبیریا (گورجستان)ش.

**<u>دووەم: کتێبی (الشرق الاسلامي في العصر الوسيط)ی (نیکیتا ئیلیسییێڤ):</u>**

ئەم کتێبە نموونەیەکە لەسەر وەرگرتنی نازانستی، لەو کتێبەدا تەنها دوو لاپەڕە (١٠٢-١٠٣) باسی فتووحات لە عیراقو کوردستانو ئێران دەکەن. ئەو دوو لاپەڕەیە چڕکردنەوەی ڕووداوەکانن، لە شەڕی قادسییەوە تا کوژرانی کیسرا.

١-ل١٦٤شوان: کاك شوان پاش باسی ناکۆکیی نێوان سەرکردەکانی کیسرا دەکاتو لەمیانەی قسەکاندا ئاشکرا دیارە ئەمە پێش شەڕی نەهاوەند بوو. سەرچاوەکەی کاك شوانیش کتێبەکەی سەرەوەیە (بەتەنیا)، لەکاتێکدا ئەو کتێبە باسی لەتلەت بوونی ئیمپراتۆرییەتی ساسانی پاش ئەو شەڕە دەکات. شوان دەنووسێت لاپەڕە ١٠٢-١٠٣، ئەو زانیارییەش لەڕاستیدا لە لاپەڕە ١٠٢ دایە.

٢-ل١٦٤ پەراوێز٢ شوان: شوان لەبارەی وەزعی لەشکری ساسانییەوە کە یەکگرتوو نەبوو دەنووسێت: ((ئەمەش زیاتر بە ویستی دەهاقەکان(دەهقانەکان/ف.ق) بوو کە دیانویست زەویو زارو سامانیان نەکەوێتە بەر شەڕ ، یاخود پارە خەرج کردن لە ئامادەکردنی لەشکر..)) - نیکیتا ئیلیسییێڤ، ل١٠٣ (بەتەنیا).

ئەم قسەیە لەو سەرچاوەیەدا نەهاتووە بەڵکو نووسەر باسی خەمی سەربەخۆبوونی هەرێمەکان دەکاتو ئەم بزاڤە لای چینی بەگزادەکان لە لادێداو خاوەنە گەورەکانی زەویدا هەستیارتر بوو.

٣-ل١٧٥ شوان: شوان باسی گرتنی شاری دینەوەر باسی قایمیی شارەکە دەکاتو پەراوێزێك دادەنێت، ئینجا دەنووسێت: شارەکانی دەوروبەری گیرابوونو هیچ جۆرە یارمەتییەکی پێنەدەگەشتو ((لە هەمووشیان گرنگتر بەلای ئێمەوە ورەبەردانی خەڵكو لەشکری ساسانی بوو)).

شوان ناوی دوو سەرچاوە دەنووسێت کە یەکێکیان ئەوەی ئیلیسییێڤە، ل١٠٢-١٠٣. بەڵام کتێبەکە یەك شت لەمبارەیەوە ناڵێت، چۆنیش دەتوانێت باسی ئەو وردەکارییە بکات لەکاتیکدا وەك وتمان ئەو دوو لاپەڕەیە باسی نزیکەی پانزە ساڵ دەکەن کە ساڵانی نێوان شەڕی قادسییە تا کوژرانی کیسران؟

**<u>سێیەم: کتێبی (تاريخ الشرق الادنى القديم)ی (د. سامی سعيد الاحمد)و (رضا جواد الهاشمی):</u>**

---

[80] لە کتێبی (مێژووی دێرینی کوردستان)مان، کتێبی دووەم، کە بۆ ڕەخنە لە کتێبەکەی دوکتۆر جەمال ڕەشید (ظهور الكورد في التاريخ) تەرخانمان کردووە ئەو وشەیەمان بەکارهێناوە، واتە ((بردن)) ئەویش لەجیاتی وشەی ڕاستەوخۆو ئاشکرای گونجاو کە شایستەی ئەو کارە نازانستیو ناڕەوایەیە.

[81] گومانم بۆ چەند سەرچاوەیەك دەچێت کە لەبارەی ئەرمینیاو ئازەربایجانەوەن.

شوان زۆر ناوی ئەو سەرچاوەیە دەبات کەچی لەو ژمارە نموونەیەی تەماشام کردوون هیچیان بەو جۆرە نین کە لەو کتێبەدا هاتوون، لەو نموونانەش تەنها ئەمانە هەڵدەبژێرم:

١-ل١١٧شوان: شوان باسی بڵاوبوونەوەی مەسیحیت دەکات، پاشان دەڵێت: ((بەتایبەتی لە خۆرهەڵاتی دیجلەو شاری هەولێر))، بۆ ئەم رستەیەش ناوی ئەو کتێبە بە تەنیادەبات (ل١٧٦)، بەڵام یەك وشە لەم رستەیە نەنووسراوەو دوو نووسەرەکە تەنها باسێکی کورتی مەسیحیەت و ئیسلام دەکەن و نەباسی خۆرهەڵاتی دیجلەو نەباسی هەولێر کراوە.

٢-ل١٢٨ شوان+ پەراوێزی ٧: لەم لاپەڕەیە چەند جارێك ناوی سەرچاوەکە نووسراوەو یەکێك لەو جارانە باسی (مەردان) ناوێك کراوە کە سەرلەشکرێکی فارسی بووەو لە سەرچاوە یۆنانییەکاندا بە مەردۆنیۆس ناسراوەو خوشکەزای داریوش یەکەم بوو..تاد. (تاریخ الشرق..، ل١٢٣ لەگەڵ سەرچاوەیەکی تردا)

بێ ئەوەی زانیاریی زیاتریش نەقل بکەین دەڵێین یەك وشە لەم جۆرە لەو کتێبەدا نەهاتووە.

٣-ل١٣٠شوان+ پەراوێزی ٦: شوان باسی هەڵهاتنی دارای سێیەم بەرامبەر ئەسکەندەر دەکات و لە پەراوێزدا دەنووسێت: ((لەرێگای رەواندوزەوە بۆ ئێران کشا))..(تاریخ الشرق.. ل١٢٨-١٢٩ لەگەڵ سەرچاوەیەکی تردا)، بەڵام بەهیچ جۆرێك ناوی رەواندوز نەهاتووە.

نموونە هێنانەوەش لەو کتێبە مرۆڤ ماندوو دەکات بۆیە ئەو سێ نموونەیەی سەرەوە بەسن.

**چوارەم تا شەشەم: سێ سەرچاوەی ئینگلیزی:**

باسی کتێبی (تاریخ الشرق..تاد)ی (د. سامی و د. رضا) پەلی باسەکە بۆ سەرچاوە ئینگلیزییەکان دەکێشێت. لەچاپی یەکەمدا نووسیبووم کە حەزم دەکرد بەدوای ئەو سەرچاوە ئینگلیزییانە بچوومایە کە شوان گوایە بەکاری هێناون چونکە کاك شوان کە هەڵە لە عەرەبییەکەیدا بینراوە چۆن ئینگلیزی دەزانێت؟[٨٢]

پێش ئەوە ی باسی سێ لەو سەرچاوانە ئینگلیزییانە بکەم کە شوان لە کتێبە عەرەبییەکەی سەرەوە ((بردوونی)) بە کورتی باسی هەموو سەرچاوە ئینگلیزییەکانی کاك شوان دەکەم:

تەماشایەکی سەرپێیی ئەو سەرچاوانە دەریدەخات کاك شوان هیچ لە زمانی ئینگلیزییەوە نازانێت و بەحاڵ وشەکان لە یەك جیا دەکاتەوە. بڕوانە لاپەڕە ٣٢٩ دەبینی لیستی سەرچاوەکان کە بیست دێڕن پڕە لە دەیان هەڵە کە هەر کەسێك ئینگلیزی بزانێت پێویست ناکات شارەزای ئەو سەرچاوانە بێت بۆ دۆزینەوەیان. ئەمانە پەیوەندییان بە هەڵەی چاپەوە نییە چونکە بە چاو دیارن: لەجیاتی کاپیتاڵ نووسینی یەکەم پیتی ناوەکان و هەندێ وشە بە سمۆڵ، وشەی هەڵە..تاد، بۆ نموونە:

**Sir Mark Sykes, <u>t</u>he <u>c</u>aliphs <u>l</u>ast hrtage, <u>as</u>hort <u>h</u>istory of the Turkish <u>e</u>mpire. (London, 1915).**

ئینجا لەو نۆ سەرچاوەیە دوانیان دووبارە بوونەتەوە! ئینجا هەڵە لە جۆری تر کە روونکردنەوەیان کاتی زۆری دەوێت.

پاش ئەمە باسی ئەو سێ سەرچاوەیە بکەم:

دوو نووسەرە عەرەبەکە (ل٤١) باسی (تەپەسەراب)ی ناوچەی کرماشان و ئەو شوێنەوارانەی دانیشتوانەکە جێیانهێشتوون (کەلوپەلی بەردین و دەفرو پەیکەر..تاد) و شوێنەکە بۆ ٦٢٠٠ پێش زاین دەگەڕێتەوە، لە پەراوێزەکانیشدا ئەم سەرچاوە ئینگلیزییە دەنووسن(پەراوێزی٧ی لاپەڕە ٤٨):

**J. Mallaart, The Earliest Settlements in Western Asia from the Ninth to the end of the Fifth Millenium B.C., Cambridge Ancient History (CAH), Vol. 1, Part 1, (Cambridge, 1970), pp.260-261.**

---

[٨٢] نووسینی چەند لاپەڕەیەکی کورتەی ماستەرنامەکەش بە ئینگلیزی هیچ لەو راستییە ناگۆڕێت چونکە هەموو کەسێك دەتوانێت ئەو کورتە عەرەبییە بۆ کاك شوان بکاتە ئینگلیزی.

بۆ زانیارییەکەی سەرەوە پەراوێزی ٨ هەیە کە نووسراوە:

**Ibid, p.262.**

واتە: ((لەهەمان شوێندا، ل٢٦٢)).

کاك شوانیش (ل٦٠) نووسیویەتی: ((وە لە (تەپەسداب) نزیك کرمنشاە پاشماوەی کاری مرۆڤ دۆزراوەتەوە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ٦٢٠٠پ.ز))، لە پەراوێزیشدا، سەرچاوە ئینگلیزییەکەی سەرەوەی نووسیوە(ل٢٦٢)، کە دیارە ئەمە ((بردنێکی رووتە)) لەو کتێبە عەرەبییە.

((بردنێکی)) تر لەو کتێبە لە لاپەڕە (٧٢)ی ماستەرنامەکەی کاك شواندایە. دوو شوێنەوارناسە عەرەبەکە (ل٥١) باسی عیلامییەکان دەکەن کە لەلایەن هەندێك کەسەوە لەگەڵ لولوبییەکانو گوتییەکانو کاششیەکان پەیوەست کراون ئەویش لەسەر بناغەی پەیوەندیی نێوان زمانەکانی ئەمانو زمانی عیلامی، بۆ ئەوەش ناوی کتێبی (ئێران)ی (گیرشمان)یان نووسیوە(ل٧٤ی کتێبەکەیان):

**R.Girshman, Iran, (Baltimore, 1954), p.50.**

کاك شوانیش دەنووسێت: ((وە عیلامییەکان پەیوەندیی بەهێزیان هەبووە لەگەڵ لولوییەکانو گوتییەکانو کاشییەکان چونکە پەیوەندی زمان بەیەکەوەی بەستبوونەوە))، ئینجا ناوی ئەو کتێبە ئینگلیزییە دەنووسێت.

وەکو تێبینییەکیش لەسەر ئەو زانیارییە، گیرشمان نووسیویەتی: ((لە باشوورەوە بۆ باکوور، عیلامییەکانو کاشییەکانو لوللوبیو گوتی هەبوون کە سەر بە هەمان کۆمەڵەی رەگەز بوونو هەموو بە چەند زمانێك قسەیان دەکرد کە خزمایەتییان لەگەڵ یەکدا هەبووە)). بەم جۆرە تەعبیرەکانی دوو نووسەرە عەرەبەکەو نووسەرە کوردەکە ورد نین، بەڵام تەنانەت زانیارییەکانی گیرشمانیش ورد نین چونکە لەو گەلانە تەنها زمانی عیلامی زانیاری لەبارەیەوە هەیە، سەبارەت بە زمانی کاششیش تەنها ژمارەیەك وشە زانراون لەکاتێکدا زمانی گوتیو لوللو تا ئێستا لەناو تاریکیدا دەژین. بەم پێیەش باسکردن لە خزمایەتیی چوار زمانەکە تەنها بۆچوونەو بەڵگەی لەسەر نییە.

سەرچاوەی سێیەم کە کاك شوان لە دوو نووسەرە عەرەبەکەی ((بردووە)) زۆر بە شێواوی ((براوە))و بۆ نوکتە دەشێت:

دوو شوێنەوارناسە عەرەبەکە (ل٤٠) باسی (کانجی دارە تەپە)[٨٣] و (تەپە ئاسیاب) لە رۆژهەڵاتی کرماشان دەکەنو بۆ ئەم زانیارییە لە پەراوێزەکاندا (ل٤٨) پەراوێزی ژمارە ٣ دادەنێن کە ئەم سەرچاوەیەیە:

**3. R. Braidwood, Bruce Howe and C.A. Reed, "The Iranian Prehistoric Project", Science, 133, (1961) pp.2008 ff.**[84]

یەکسەر دوای ئەوەش باسی ئەشکەوتی (تانکی بدا)[٨٥] لە کێوەکانی بەختیاری باکووری رۆژهەڵاتی تستر(شوشتر) دەکەنو بۆ ئەمە پەراوێزی ژمارە ٤ دادەنێن کە سەرچاوەیەکی ترە:

**4. Jacquetta Hawkes and Sir Leonard Woolley, History of Mankind, Vol. 1, Prehistory and the Beginnings of Civilization, (New York, 1963), p.230.**

کاك شوانی خۆشمان (ل٧٣) زانیاریی دووەمی وەرگرتووە بەڵام کاتێك نۆرەی ((بردنی)) ناوی سەرچاوە ئینگلیزییەکە دێت لێی تێك دەچێتو ناوی سەرچاوەی یەکەمی ((دەبات))!! واتە دەنووسێت: ((لە ئەشکەوتی (تانکی) لە چیای بەختیاری کە دەکەوێتە باکوری خۆرهەڵاتی شوشتر "تستر" پاشماوەی مرۆڤی چەرخی بەردینی نوێی تیادا دۆزراوەتەوە)) ئینجا ئەم سەرچاوەیە دادەنێت:

**R. Braidwood, Bruce Howe and C.A. Reed, "Reed Iranian Pre historic Project", Science, 133, (1961) pp. 208 ff.**

---

[٨٣] ناوی دروستی: گەنجی دارە تەپە.

[٨٤] ژمارەی لاپەڕە ٢٠٠٨و ئەوانەی دوای: رەنگە هەڵەی چاپ نەبن چونکە هەندێك گۆڤار بەدرێژایی ساڵ یەك تەرقیم بەکاردەهێننو ژمارەکە بەو جۆرە گەورە دەبێت، کاك شوان ئەو ژمارەیەی نەچووە بە مێشکداو نووسیویەتی ٢٠٨.

[٨٥] بەپێی برادەرێکی کوردستانی ئەودیو ناوە دروستەکە: (تەنگی پیٚ بدە)یە.بۆم نەکرا لەوە دڵنیا بم.

ئەمە لەو جۆرە ((بردنانەیە)) کە خۆیان خۆیان ئاشکرا دەکەن‌و زۆربەی ئەوانەی زانیاری‌و ناوی سەرچاوە ((دەبەن)) هەڵەی وا دەکەن بەتایبەت ئەگەر زمانی ئینگلیزی (یان هەر زمانێکی تر کە سەرچاوەکەی پێ نووسراوە) نەزانن.

بەپاڵ ئەوەی سەرەوە کاتێك شوان ناوی سەرچاوەکەی ((بردووە)) ئەوەی زۆر بە سەقەتی کردووەو سەلماندوویەتی کە تەنانەت وشەکانیش لە یەك جیا ناکاتەوە، بینیمان شوان ئاوا لەو پەراوێزەدا نوسیویەتی:

R. Braidwood, Bruce Howe and C.A. Reed, “Reed Iranian Pre historic Project”, Science, 133, (1961) pp. 208 ff.

لە لیستی سەرچاوە ئینگلیزیەکانیشدا دوو جار نووسیویەتی، هەردوو جارەکەش سەقەتتر لەوەی سەرەوە:

R. Braidwood, Bruce Howe and C.A. Reed, “Reed Iranian pre Historiect, 1961.

R. Branid wood, Bruce House and C.A. Reed, Reed Iranian Pre Historjc project”, (science1961)..

باقی سەرچاوە ئینگلیزییەکانی کاك شوان بۆ دەرفەتێکی تر هەڵدەگرم، یان ئەگەر ئەو دەرفەتە نەڕەخسا بۆ ڕەخنەگری تر جێدەهێڵم.

## کۆتایـــــی

کاك شوان کتێبەکەی پێشکەش بە کورد کردووەو نووسیویەتی :((پێشکەشە بە گەلی پەرتکراوو نیشتمانی سووتاوم))! هەڵبەت خوێنەرو پێش هەموو خوێنەرێك ئەو قوتابییەی زانکۆ کە کاك شوان وانەی پێ دەڵێتەوە ئێستا زیاتر لە شوان خەفەت بۆ نیشتمانەکەی دەخوات کە ئەمە حاڵی خوێنەوارییەکەیەتی: ئەمە حاڵی لێکۆڵینەوەیەکە ڕێگە بە خاوەنەکەی دەدات وانەی مێژوو بە قوتابیانی زانکۆ بڵێت. ئینجا هەقیەتی بپرسێت: ئەگەر ئەمە ئیشەکانی ئەو مامۆستایە لەگەڵ سەپەرشتیارەکەی خۆی‌و دکتۆرەکانی ترو زانکۆ بەشێوەیەکی گشتی بێت ئەی حاڵی لەگەڵ قوتابیان چی بێت کە هێشتا سەرەتای خوێندنی زانکۆیانە؟

ڕەنگە کاك شوان ئەمەی بە کوردایەتی زانیبێت بەڵام نەك من بەتەنها بەڵکو هەموو کەسێك ئەوەی پێی دەڵێت کە کوردایەتی بە تەزویرکردن ناکرێت. کوردایەتی بە خەڵەتاندنی زانکۆو قوتابییەکانی‌و خوێنەری کورد بە گشتی ناسەلمێنرێت. کوردایەتی ئەوە نییە هەرچۆنێك بێت مرۆڤ بڕوانامەیەك وەربگرێت چ جای ئەوەی لێکۆڵینەوەکەی شایەنی ئەو بڕوانامەیە نەبێت.

بەبۆچوونی خۆشم زانکۆی سلێمانی (یان ئەوانەی لە پشتی ئەم ئیشەن لە زانکۆ) بۆیە مامۆستای زانکۆی لە هەردوو زانکۆی سەلاحەددین‌و دهۆك لە موناقەشەی ماستەرنامەکە بەشدارنەکردو زانکۆ قەناعەتی بەوە کرد لە لیژنەی موناقەشەکە تەنها یەك کەس هەبێت لە مێژووی ئیسلامی پسپۆڕ بێت چونکە زانکۆ، یان ڕاستتر ئەو کەسانە، دەیانزانی ئەگەر ئەو مامۆستایانە بهاتنایە ئەم ئیشەیان بۆ نەدەچووەسەر، ئێستاش دەبێت باجی ئەم بەشدارنەکردنە بدەن.

لێرەدا ناچارم کۆتایی بەم کتێبە بهێنم بەڵام سوپاسی خودا دەکەم بۆ ئەم ناچارییە. ئەو ناچارییەی پاڵی پێوەنام کۆتایی بەم ڕەخنەیەم بهێنم ئەوەیە کە زۆرم مەبەست بوو تا دەوامی زانکۆ مابێت ئەم کتێبە بخەمە بەردەستی خوێنەران‌و بەتایبەتی قوتابیانی زانکۆو مامۆستاکانی، ئەوە نەبوایە تەماع یەخەی بەرنەدەدام‌و لەگەڵ کتێبەکەی کاك شوان بەردەوام دەبووم، لەم سەرچاوە بۆ ئەو سەرچاوە، تا وام لێدەهات بۆ ماوەیەکی زۆر ئیشم نەبێت شوان‌و کتێبەکەی کاك شوان نەبێت.

بۆ جاری نازانم چەندەمیش دەیڵێمەوە: ئەم ماستەرنامەیە بەهەشتی ڕەخنەگرانە" ئیشی ڕەخنەگر لەگەڵیدا زۆر ئاسانە بەمەرجێ سەرچاوەکانی دەستبکەوێت. ئەو ڕەخنەگرەش جگەلەوەی وەرزەکەی تەڕو پڕ خێرو بەرەکەت دەبێت لەزەتێکی زۆر لەو کارە دەبینێت ئەویش هەروەکو لەزەتی هەموو کارێکی بەبەرهەمو سەرکەوتوو.

# سەرچاوەکان

## یەکەم – سەرچاوە کۆنەکان

* ابن الاثير، الكامل في التاريخ، دار الطباعة المنيرية، القاهرة، (نشر لاول مرة ١٣٤٩)[٨٦] .

*ابن بطوطة، ابو عبدالله، محمد بن ابراهيم الطنجى، رحلة ابن بطوطة (تحفة النظار في غرائب الامصارو عجائب الاسفار)، دار صادر، دار بيروت، بيروت، ١٩٦٠ [٨٧].

* ابن جبير، ابو الحسين محمد بن احمد الكناني الاندلسي البلنسي، رحلة ابن جبير (تذكرة بالاخبار عن اتفاقات الاسفار)[٨٨]:

١–مطبعة بريل، ليدن، ط٢، ١٩٠٧.

٢ –مطبعة السعادة، القاهرة، ط١، ١٣٢٦–١٩٠٨ وهي مأخوذة عن طبعة ليدن.

* ابن حوقل، محمد بن علي النصيبي، صورة الارض، دار مكتبة الحياة، بيروت، ١٩٧٩.

* ابن خرداذبة، المسالك والممالك (و معه نبذ من كتاب الخراج وصناعة الكتابة)، مكتبة المثنى، بغداد، عن طبعة بريل، ١٨٨٩.

* ابن خلدون، كتاب العبر وديوان المبتدأ والخبر في اخبار العرب والعجم والبربر..، بيروت، ١٩٧٩.

* ابن خلدون، مقدمة ابن خلدون، طبعة، دار العودة ، بيروت، د.ت، و طبعةالمكتبة التجارية الكبرى، القاهرة، د.ت[٨٩] .

* ابن عبدالحق البغدادى، مراصد الاطلاع على اسماء الامكنة والبقاع، تحقيق محمد على البجاوى، دار احياء الكتب العربية، ط ١، ١٣٧٤–١٩٥٥[٩٠]

* ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب في اخبار من ذهب، مكتبة القدس، ١٣٥٠ ه[٩١] .

*ابن الفقيه، مختصر كتاب البلدان، طبع في مدينة ليدن، مطبعة بريل، ١٣٠٢ه –١٨٨٥م.

*ابن قيم الجوزية، اخبار النساء، تحقيق الدكتور نزار رضا، دار مكتبة الحياة، بيروت، ١٩٦٤[٩٢].

*ابن كثير، البداية والنهاية في التاريخ، مطبعة السعادة، دون تاريخ[٩٣].

* ابو حنيفة الدينورى، الاخبار الطوال، تحقيق عبدالمنعم عامر، مراجعة د. جمال الدين الشيال، دار احياء الكتب العربية، القاهرة، ١٩٦٠.

* ابو الفداء،عماد الدين اسماعيل، تقويم البلدان، اعتنى بتصحيحه وطبعه رينود والبارون ماك كوكين ديسلان،دار الطباعة السلطانية، باريس١٨٤٠،اعادت طبعه بالاوفسيت مكتبة المثنى، بغداد[٩٤].

[٨٦] شوان چاپێکی نوێتری نووسیوە.

[٨٧] جگەلە یەك دوو هەڵە لەناوی سەرچاوەکە لەلایەن شوانەوە، شوان دەنووسێت: ١٩٦٤. هەتا ئەگەر ڕاستیش بێت چاپێکی تری وا هەیە زانیارییەکەی شوان (بڕوانە ژمارە: پانزە) هەر هەڵەیە.

[٨٨] بۆ ئەم چاپەو ئەوەی شوان نووسیویەتی بڕوانە ژمارە سی و شەش.

٨٩ شوان چاپی ١٩٩٩ ی نووسیوە.

[٩٠] لای شوان بەهەڵە نووسراوە ١٩٥٤–١٩٥٥.

[٩١] لای شوان: دار الكتب العلمية، بيروت (دون تاريخ). لاپەڕەکانی هەردوو چاپەکە یەکن.

[٩٢] نوسخەی شوان ١٩٧٩.

[٩٣] شوان چاپی: دار الفكر، بيروت، ١٩٧٨ دەنووسێت. ئەوەی خۆم جیاوازیی دوو یان سێ لاپەڕەی هەیە.

[٩٤] شوان نووسیویەتی (١٨٥٠)و ئاماژەی بۆ (مكتبة المثنى) نەکردووە.

* ابو الفداء، المختصر في اخبار البشر، مطبعة الحسينية، القاهرة،(دون تاريخ).

* ابو يوسف يعقوب بن ابراهيم، كتاب الخراج، المطبعة السلفية ١٣٩٦.[٩٥]

* الازدي، ابو زكريا يزيد بن محمد بن الياس، تاريخ الموصل، تحقيق د. على حبيبة، دار التحرير، القاهرة، ١٩٦٧.

* الاصطخري، ابو اسحق ابراهيم محمد الفارسي، المسالك والممالك، تحقيق د. محمد جابر عبدالعال الحسيني، مراجعة محمد شفيق الغربال ،دار القلم، القاهرة، ١٣٨١ -١٩٦١[٩٦]

* اولياچلبي، سياحەتنامە، و. سەعيد ناكام، بەغدا، ١٩٧٩

* البلاذري، ابو الحسن احمد بن يحيى بن جابر، فتوح البلدان، مراجعة وتعليق رضوان محمد رضوان، المكتبة التجارية الكبرى، القاهرة، ١٩٥٩[٩٧].

* البيروني، ابو الريحان محمد بن احمد، الاثار الباقية عن القرون الخالية، (دكتۆر سى ئێدوارد زاخاو)، ١٩٢٣، اعادت طبعه بالاوفست مكتبة المثنى، بغداد، ١٩٦٤[٩٨].

*الثعالبى، ابو منصور عبدالملك بن محمد بن اسماعيل، تاريخ غرر السير، نشر وترجمة هـ. زۆتنبێرب، مكتبة الاسدى، طهران ١٩٦٣[٩٩].

* الجهشيارى، ابو عبدالله محمد بن عبدوس، كتاب الوزراء والكتاب، تصحيح وتحقيق عبدالله اسماعيل الصاوى، مطبعة عبدالحميد احمد حنفى، مصر، ١٣٥٧ – ١٩٣٨[١٠٠].

* الحموي، ياقوت، المشترك وضعا والمفترق صقعا، طبعة گونكتن ١٨٤٦، اعادت طبعه بالاوفست مكتبة المثنى، بغداد.

* الحموى، ياقوت، معجم البلدان، دار بيروت، دار صادر، بيروت، ١٩٥٧[١٠١].

* الحميري، الروض المعطار في خبر الاقطار، تحقيق الكتور احسان عباس، ط٢، مكتبة لبنان، بيروت، ١٩٨٤[١٠٢].

* خليفة بن خياط، تاريخ خليفة بن خياط، تحقيق د. اكرم ضياء العمرى، ط١ ،مطبعة الاداب، النجف، ١٣٨٦هـ ـ١٩٦٧[١٠٣].

* الدميري، حياة الحيوان الكبرى،ج١، مطبعة السعادة، القاهرة، ١٣٣٠ هـ [١٠٤].

*الزمخشري، ابو القاسم محمود بن عمر، الجبال والامكنة والمياه، تحقيق د. ابراهيم السامرائى، مطبعة السعدون، بغداد، ١٩٦٨.

* زينوفون ، حملة العشرة الاف، الحملة على فارس، ت. يعقوب افرام منصور، مكتبة بسام، ١٩٨٥.

* سهراب، عجائب الاقاليم السبعة الى نهاية العمارة، اعتنى بنسخه وتصحيحه هانس فون مژيك، مطبعة ادولف هولزهوزن، فيينا، ١٣٤٧هـ – ١٩٢٩ [١٠٥].

* السيوطى، جلال الدين عبدالرحمن بن ابىبكر، تاريخ الخلفاء، ط١ مطبعة السعادة القاهرة، ١٩٥٩، اعادة طبعه مطبعة منير، بغداد، ١٩٨٣[١٠٦].

*شيخ الربوة، شمس الدين ابو عبدالله محمد ابوطالب، نخبة الدهر فى عجائب البر والبحر، نشره ا. مين Mehren لايبزگ ١٩٢٨، اعادت مكتبة المثنى طبعه[١٠٧].

[٩٥] شوان چاپێکی تری بەکارهێناوە بەڵام نووسیویەتی ١٣٥٢، ١٣٨٢ ئیتر نازانم چۆن ئەم دوو ساڵەی لێدراوە.

[٩٦] شوان چاپێکی تری نووسیوە بەڵام جگە لەهەندێ شت لاپەڕەکان وەکو یەکن.

[٩٧] شوان چاپێکی تری نووسیوە بەڵام لاپەڕەکان لەهەردوو چاپەکە یەکن لای شوان لەجیاتی ابو الحسن (ابو العباس) نووسراوە.

[٩٨] شوان نوسیویەتی (عن طبعة ١٩٢٣ دار وسخاو)!!

[٩٩] هەندێك لە زانیارییەکانی ناوی سەرچاوەکەم لە بەرگی پشتەوە (بەفەڕەنسی) وەرگرتووە.

[١٠٠] چاپێکی تری هەمان ساڵ بە تەحقیقی سێ کەس هەیە. کاك شوان ناوی کتێبەکە لە لیستی سەرچاوەکاندا ناهێنێت.

[١٠١] لای شوان (دار بیروت) نییەو مێژوی چاپیشی نییە.

[١٠٢] شوان چاپی یەکەم (دار القلم، ١٩٧٥)ی نووسیوە. لاپەڕە بەکارهێنراوەکان لەهەردوو چاپدا یەکە.

[١٠٣] شوان چاپی دووەمی نووسیوە.

[١٠٤] الدمیری: شوان چاپێکی تر دەنووسێت بەڵام جیاوازیی چاپ گرنگ نییە چونکە شوان ئاماژە بۆ لاپەڕەکانی بەرگی یەکەمو بۆ بابەتێکی دیار دەکات ئەویش بابەتی ئەبوو موسلیمی خوراسانی.

[١٠٥] شوان هەڵەی لە زانیارییەکانی ساڵی چاپ..تاد کردووە.

[١٠٦] شوان نوسیویەتی چاپی ٢و هەمان ساڵ!

* الطبری، ابو جعفر محمد بن جریر، تاریخ الرسل والملوك، تقدیم ومراجعة صدقی جمیل العطار، دار الفكر، بیروت، ١٩٩٨[١٠٨].

* قدامة بن جعفر، الخراج وصناعة الكتابة،شرح وتحقیق د. محمد حسین الزبیدي، دار الرشید، بغداد، ١٩٨١.

* القزوینی، ابو زكریا محمد بن محمود،اثار البلادو اخبار العباد، دار صادر، دار بیروت، بیروت، ١٩٦٠.

*القلقشندی، ابو العباس احمد بن علی، صبح الاعشا في صناعة الانشا، دار الكتب الخدیویة، المطبعة الامیریة، القاهرة، ١٩١٣-١٩١٩[١٠٩].

* المسعودی، التنبیه والاشراف، تصحیح ومراجعة عبدالله اسماعیل الصاوی، دار الصاوی، ١٣٥٧-١٩٣٨[١١٠].

* المسعودی، مروج الذهب ومعادن الجوهر، تحقیق محمد محی الدین عبدالحمید، ط٣، مطبعة السعادة، القاهرة، ١٣٧٧-١٩٥٨ [١١١].

* المقدسي البشّاري، محمد بن احمد بن ابی بكر، احسن التقاسیم في معرفة الاقالیم، طبعة لیدن، مطبعة بریل، ١٨٧٧[١١٢].

* الیعقوبی، احمد بن ابي یعقوب بن واضح الكاتب، كتاب البلدان، المطبعة الحیدریة، ط ٣، النجف ١٣٧٧هـ ـ ١٩٥٧[١١٣].

## دووەم : سەرچاوە نوێکان

* ابراهیم زكي خورشید،(رئیس التحریر)، دائرة المعارف الاسلامیة، د.ت[١١٤].

* احمد زینی دحلان ، الفتوحات الاسلامیة، مؤسسة الحلبی وشركاه، القاهرة، ١٣٨٧-١٩٦٨[١١٥].

* امیل، بول، تاریخ ارمینیا، ت. شكري علاوي، دار مكتبة الحیاة، بیروت، د.ت.

* ئاورنگ، م.، كوردناسی، و. برهان قانع، چاپی٢، چاپخانەی ژیار، سلێمانی، ١٩٩٩.

* ایلیسیف، نیكیتا، الشرق الاسلامي في العصر الوسیط، ت. منصور ابو الحسن، دار الكتاب الحدیث، بیروت، ١٩٨٦.[١١٦]

* جمال بابان، اصول اسماء المدن والمواقع العراقیة، ج١، مطبعة المجمع العلمي الكردي، بغداد، ١٩٧٦.

* جمال رشید احمد (الدكتور)، دراسات كردیة في بلاد سوبارتو، الامانة العامة للثقافة والشباب لمنطقة كردستان، بغداد، ١٩٨٤.

* جەمال نەبەز (دكتۆر)، كوردانی سەرگەردان و برا موسڵمانەكانیان، و. S.K ،كۆمەڵەی خوێندكارانی كوردستان، ١٩٩٨.

* حسام الدین النقشبندی (الدكتور)، اذربیجان، ٤٢٠-٦٥٤هـ، ١٠٢٩-١٢٥٦م، دراسة في احوالها السیاسیة والحضاریة، رسالة دكتوراه، مطبوعة علی الالة الكاتبة، جامعة بغداد، ١٩٨٤.

[١٠٧] شوان ساڵی ١٩٢٣ ی نووسیوە. هەندێ زانیاریم لەبەرگی پشتەوە (بەفەڕەنسی) وەرگرت.

[١٠٨] جگە لەم چاپە، كە هەمان چاپەكەی شوانە، چاپێكی دیكەم بۆ هەندێك زانیاریی زیادە بەكارهێناوە : مطبعة الاستقامة، القاهرة، ١٩٣٩و لە هەر شوێنێك بەكارم هێنابێت نووسیومە (١٩٣٩).

[١٠٩] شوان نوسخەیەكی نووسیوە كە لەسەر نوسخەی (المطبعة الامیریة) وێنەكراوەو لەچاپدراوەتەوە. ئەو نوسخەیە هی(المؤسسة المصریة العامة للتالیف والترجمة والطباعة والنشر) كەچی دەنووسێت (المؤسسة المصریة للطباعة). شوان هەروەها دنووسێت ١٩١٣-١٩١٨ زاینی. كە ساڵی دووەمیان هەڵەیە جگە لەوەی ئەم ساڵانە هی چاپە كۆنترەكەن.

[١١٠] لەبارەی چاپەكەوە خاڵی (بیست و شەش) تەماشا بكە.

[١١١] شوان ناوی چاپێكی تر دەنووسێت.

[١١٢] شوان باس لەچاپی (١٩٠٦) دەكات. شوان چ لە ڕۆژی موناقەشەكەو چ لە كتێبەكە ناوەكە وا دەڵێت: المُقَدّسي بەڵام ڕاستەكەی المَقْدِسي یە. الجعفری دەڵێت یاقووتی حەمەوی وای نووسیوەوشێوازی یەكەم لەلایەن نووسەری تازەوە وەكو شپرنگەر Sprenger وتراوە : یاسین ابراهیم علي الجعفري، الیعقوبي المؤرخ والجغرافي ، دار الرشید للنشر، بغداد ، ١٩٨٠، ل٢٢٤. ئەوەی یاقووتم لە بەرگی ٥، ل١٦٨، باسی(بیت المَقْدِس) بینی.لەمیانەی قسەیەكی یاقووتیش دەزانین المقدسی خەڵكی بیت المقدسەو لەمەوە الجعفری دەڵێت لەفزی دروستی ناوەكە المَقْدِسي یە.

[١١٣] شوان ناوی نووسەرو ساڵی مردنی بە شێوەیەكی تر دەنووسێت. لێرەدا ئەوەمان نووسی كە لەسەر كتێبەكەدا هاتووە. چاپی ١٩٥٧ یش لەسەری نووسراوە چاپی سێیەم بەڵام شوان ناوی چاپی سێیەمی نەبردووە. ساڵی كۆچیشی بەهەڵە ١٣٣٧ ی لە جیاتی ١٣٧٧ نووسیوە. سەیر ئەوەشە لاپەڕەكانی كتێبەكە كە شوان ئاماژەی بۆ كردوون هی چاپی یەكەمن (بۆ نموونە لاپەڕە ٣٩) كەچی لاپەڕەكانی چاپی ١٩٥٧ كە شوان گوایە بەكاری هێناوە جیان (لە نموونەی سەرەوەدا: لاپەڕە ٣٧). بەكورتی شوان ژمارەی چاپ و ساڵی كتێبەكەو ژمارەی لاپەڕەكانی تێكەڵ و پێكەڵ كردووە. ئەمەش جگە لە زانیارییە هەڵەكان كە هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی كتێبەكەی نەدیوە.

[١١٤] شوان لە لیستی سەرچاوەكاندا تەنها ناوی سەرچاوەكەی نووسیوە لەگەڵ ناوی ئەو شوێنەی باسی هاتووە.

[١١٥] شوان چاپێكی تری كتێبەكەی نووسیوە.

[١١٦] شوان ناوی بڵاوكەرەوەو شوێن و ساڵی نەنووسیوە.

* حسين قاسم العزيز (الدكتور)، البابكية او انتفاضة الشعب الاذربيجان ضد الخلافة العباسية، مكتبة النهضة، بغدد، دار الفارابی، بيروت، ١٩٦٦[١١٧].

*حسين مروة(دكتور)،النزعات المادية في الفلسفة العربية الاسلامية،دار الفارابی،بيروت،ط٥، ١٩٨٥.[١١٨]

* توفيق سلطان اليوزبكی(الدكتور) ، دراسات في النظم العربية الاسلامية، الموصل ،ط١ ١٩٧٧، ط٣ ١٩٨٨[١١٩].

* ڕەشاد میران (دکتۆر) ، ڕەوشی ئاینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا، چاپی دووەم، سەنتەری برایەتی، ٢٠٠٠[١٢٠].

* ڕەفیق سابیر، بەرەو مێژوو، کورتە باسێکی فیکری – مێژوویی، سوید، ١٩٩١.

*سامي سعيد الاحمد (الدكتور)، رضا جواد الهاشمي، تاريخ الشرق الادني القديم، ايران والاناضول، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، د.ت.

* صبحي الصالح(الدكتور)،النظم الاسلامية نشأتها وتطورها، ط٢،دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٦٨[١٢١].

* طه باقر ، فؤاد سفر ، المرشد الى مواطن الاثار والحضارة،مديرية الفنون والثقافة الشعبية، بغداد، الرحلة الثالثة، ١٩٦٦، الرحلة السادسة، ١٩٦٦.

* عباس عبدالكريم، کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٧.

* فيلد، هنري، جنوب كردستان، دراسة انثروبولوجية، ت. جرجيس فتح الله، دار اراس، ط١، اربيل، ٢٠٠١[١٢٢].

* كريستنسن، ارثر، ايران في العهد الساساني، ت. يحيى الخشاب، القاهرة، ١٩٥٧.

*لسترانج،كي،بلدان الخلافة الشرقية،ت.بشير فرنسيس و كوركيس عواد،مطبعة الرابطة،بغداد، ١٩٥٤

* لبيد ابراهيم احمد(الدكتور)، ابراهيم نمير سيف الدين، عصر النبوة والخلافة الراشدة،ج١و٢، مكتبة المعارف، الرباط، ط٣، ١٩٨٤[١٢٣].

* محمد بديع شريف(الدكتور)، الصراع بين الموالي والعرب، دار الكتاب العربی، القاهرة، ١٩٥٤.

* محمد جاسم حُمادي، الجزيرة الفراتية والموصل، دراسة في التاريخ السياسی والاداری، دار الرسالة، بغداد، ١٩٧٧.

* محمد خضری بك، محاضرات تاريخ الامم الاسلامية،الدولة الاموية، المكتبة التجارية الكبرى، القاهرة، ١٩٦٩[١٢٤].

* محمد رشيد بن داود بن السيد سعدی، كتاب قرة العين في تاريخ الجزيرة والعراق والنهرين، مطبعة الرشيد، بومبی، ١٣٢٥ هـ[١٢٥].

* محمود شاكر، التاريخ الاسلامی، المكتب الاسلامی، ط٨، ٢٠٠٠[١٢٦].

* هاشم رضی، زەردەشت و ئامۆژگارییەکانی، و. عومەر گۆمەیی، سلێمانی، ٢٠٠١.

* هيكل باشا، محمد حسين، الفاروق عمر، مطبعة مصر، القاهرة، ١٣٦٤ هـ[١٢٧].

* ولهاوزن، يوليوس، الدولة العربية وسقوطها، ت. الدكتور يوسف العش، دمشق، ١٩٥٦.

## ئەو سەرچاوانەی لەم ڕەخنەیەدا بەکارهاتوون جگە لەوانەی لە ماستەرنامەکەدا نووسراون

* ارنولد،ت. و. ، الدعوة الى الاسلام، بحث في تاريخ نشر الدعوة الاسلامية، ت. حسن ابراهيم حسن و عبدالمجيد عابدين و اسماعيل النحراوي، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٤٧.

[١١٧] بۆ هەڵەی شوان لەبارەی ناوی نووسەرەکە بڕوانە ژمارە (یەك) واتە کتێبەکەی (ڤلهاوزن).
[١١٨] شوان ناوی (چاپی پێنجەم) ناهێنێت کەئەم چاپەش ساڵی (١٩٨٥)ەو شوان ئەم ساڵەی نووسیوە.
[١١٩] شوان چاپی دووەمی نووسیوەو ئێمە هەردوو چاپی یەکەم و سێیەممان دەستکەوتبوو.
[١٢٠] شوان کتێبەکەی لە لیستی سەرچاوەکاندا نەنووسیوە.
[١٢١] شوان ناوەکەی لە لیستی سەرچاوەکاندا نەنووسیوە.
[١٢٢] شوان نە خانەی ئاراس و نە ساڵەکەی نووسیوە.
[١٢٣] بڕوانە لاپەڕە ٣١ ی ئەم کتێبەمان.
[١٢٤] شوان دەنووسێت: محاضرات في تاريخ.. ئەمەش هەڵەیە چونکە (في)ی تێدا نییە، ناشنووسێت الدولة الاموية.
[١٢٥] بڕوانە کتێبی ژمارە (شەش) بۆ هەڵەی ناوی سەرچاوەکە.
[١٢٦] شوان ناوەکەی لە لیستی سەرچاوەکاندا نەنووسیوە.
[١٢٧] بڕوانە شتێکی خۆش لەبارەی ناوی نووسەرەکە، کتێبی ژمارە (بیست و دوو).

* پارکنسن، روجر، موسوعة الحرب الحديثة، ج٢، ت. سمير عبدالرحيم الچلبی، دار المامون، بغداد، ١٩٨٠.

* دو بوشير، غی، تشريح جثة الاستعمار، ت.ادوار الخراط، دار الاداب، بيروت، ط١، اذار،١٩٦٨.

* جورج قرم ، تعدد الاديان وانظمة الحكم، دراسة سوسيولوجية وقانونية مقارنة، دار النهار، بيروت، ١٩٧٩.

* شبنغلر، اسوالد، تدهور الحضارة الغربية، ت. احمد الشيباني، دار مكتبة الحياة، بيروت، د.ت.

* صحيح البخاري.

* صحيح مسلم.

* فيشر، هـ. ا. ل. ، تأريخ اوربا في العصور الوسطى، القسم الاول، ت. محمد مصطفى زيان و السيد الباز العريني، دار المعارف، القاهرة، ١٩٥٠، ل٦١.

* لوبون، غوستاف ، حضارة العرب ، ت. عادل زعيتر ،ط٢، ١٣٦٨-١٩٤٨، مطبعة دار احياء الكتب العربية، ل١٦٢.

* محمد امين زكی، خلاصة تاريخ الكرد وكردستان من اقدم العصور التاريخية حتى الان، ت. محمد علی عونی، بغداد ١٩٣٦.

* Kingfisher History Encyclopedia, Charlotte Evans (Gen. Edit.), Kingfisher, print.in Hong Kong, reprint. 1999, p.179.

* D.D.Luckenbill, Ancient Records of Babylonia and Assyria, vol.1, Chicago1926, S 450.

* G. Mourgue, Aux source de Proche-Orient, Fayard, 1972, p.246.

ئەمەش جگەلە کەمێك سەرچاوە لەناواخنی باسەکان ناویان براوەو بەپێویستم نەزانی بیاننووسم.